﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا ضَرَبْتُمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَتَبَيَّنُوا وَلَا تَقُولُوا لِمَنْ أَلْقَى إِلَيْكُمُ السَّلَامَ لَسْتَ مُؤْمِنًا ... ﴾ [ النساء : ٩٤ ] .

# پەیامی میحراب

# [ زیادەڕەوی لە تەکفیر ]

## مەترسی و ئاکامە خراپەکانی لەسەر

## تاك و کۆمەڵگەی موسوڵمانان

**چەند تێبینیەك :**

١ ـ بەشداریکردن بۆ . . . .

٢ ـ کاتی تاقیکردنەوەکە لە ( ؟؟؟ ) ـی ؟؟؟؟ ، و ڕاستەوخۆ لە دوای نوێژی عەسر دەکرێت ، و شوێنەکەشی مزگەوتی شەهیدان دەبێت .

٣ ـ ؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟ .

بۆ هەر پرسیار و ڕوونکردنەوەیك پەیوەندی بکە بە : ( ٠٧٧١٩٩٠٩٥٨٦ )

\

هیوامان سەرکەوتن و سودبینینیە بۆ هەموو لایەك

# ( پێشەكی )

سوپاس و ستایش بۆ خوای پەروەردگار ، درورد و صەڵات و سەلامیش لە سەر پەیامبەری ئازیز و خۆشەویستمان ، لەگەڵ یار و یاوەران ، و شوێنکەوتوانی بەچاکە تا ڕۆژی دوایی ، خوێنەری بەڕێز بێگومان پرس و باسی تەکفیرکردن ، یەکێکە لە پرس و باسە گەورەکان کە پێی خەڵکانێکی زۆری تێدا هەڵخلیسکاوە کە چوونەتە ناویەوە ، و تێگەیشتنی زۆرێك لەوانەی تێدا گومڕا بووە کە لاف و گەزافی زانستی شەرعیان لێدەدا ، و پێنووسی نوسەرانێکی زۆری تێدا سەرگەردان بووە بە درێژایی مێژوو ـ بەتایبەتیش لەسەردەمانی خۆماندا ـ ، تاکو وای لێهاتووە خەڵکانێکی زۆر لەوانە ناوی بانگخوازیان لە خۆیان ناوە ، و خۆیان بە درۆ و بوهتانەوە داوەتە پاڵ زانست و زانست لێیان بەریە ، خۆیان ناگرنەوە لە تەکفیرکردنی ئەوانەی کە پێچەوانەیان دەبنەوە ، بەکەمترین شوبهە و گومان لەسەر ئاستی تاك کەسی ، یان لەسەر ئاستی کۆمەڵ و کۆمەڵگاکەیاندا بێت !!! کەچی لە کاتێکدا کە هەر کەسێك کەمترین بەرژەوەندی دونیا و دواڕۆژی خۆی ڕەچا بکات نابێت دەستوەرداتە ئەم پرس و باسە بە زانستێکی تۆکمە و بوونی بەڵگەی قورئانی پیرۆز و سوننەتی پەیامبەرمان ﷺ ، و بەئاگا بێت لە دەرکردنی موسوڵمانان لە ئایین و حوکمدان بە تەکفیرکردن و پاشگەزبوونەوەیان تەنها بە تێگەیشتنی خۆی و ، بە بەچاکدانانی عەقڵی ، چونکە دەرکردنی موسوڵمان لە ئیسلام یەکێکە لە گەورەترین و ترسناکترینی پرس و باسەکان ، هەروەك لە دوو توێی ئەم نووسینەدا دەردەمەوێت .

لە لایەکی تریشەوە زیادڕەویکردن لە ئایین هۆشداری لەسەر دراوە لە ئایەتەکانی قورئان و فەرموودەکانی سەروەرمان ﷺ ، ئەوەتا پەیامبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (( إِيَّاكُمْ وَالْغُلُوَّ فِي الدِّينِ ، فَإِنَّمَا أَهْلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمُ الْغُلُوُّ فِي الدِّينِ )) [٥] ، واتە : ئامان ئاگاتان لە زیادڕەوی بێت لە ئایین ، چونکە هەر تەنها زیادڕەویە لە ئایین کە ئوممەتانی پێش ئێوەی لەناوبردووە .

سەبارەت بە گرنگترین هۆکارە سەرەکیەکانی هاتنە کایەی تەکفیر و زیادڕەوی تێکردنی ـ لە کۆن و تازەدا ـ ، و بڵاو بوونەوەی لەناو ئوممەتدا ، ئەمانەیە :

هۆکاری یەکەم : نەشارەزایی لە بنەواکانی ئەهلی سوننە ، وپێوەرەکانیان لە پرس و باسی تەکفیردا .

هۆکاری دووەم : تێنەگەشتنی تەندروست لە دەقەکانی قورئا ن وسوننەت ، و دانەنانی لە شوێنی خۆی .

هۆکاری سێیەم : دەستێوەردانی گەنجانی کاڵفام و نەخوێندەواری شەرعی لەم پرس و باسەدا .

---

[٥] رواه النسائي ، برقم : ٣٠٥٧ ، وصححه الألباني في صحيح وضعيف سنن النسائي برقم : ٣٠٥٧ .

هۆکاری چوارەم : وەرنەگرتنی زانراوەکانی ئەم پرس و باسە لە شەریعەت و لە سەرچاوە ڕەسەنەکانیەوە .

هۆکاری پێنجەم : لانەکردنەوەی گەنجان بۆ تێگەیشتنی زانایان و دانابییان .

هۆکاری شەشەم : کەمتەرخەمی کردن لە گوێگرتن بۆ وتە و وانە و کۆڕی و گومانی سەرانی گومڕای تەکفیر لەم سەردەمەدا .

دواکارین لەپەروەردگار ئەم پرۆژەیە بکاتە هەوێنی چارەسەرکردنی ئەم نەخۆشیە کوشندە و موسوڵمانان و وڵاتمان بپارێزێت لە ئاکامە خراپەکانی ئەم نەخۆشیە ئایینی و کۆمەڵایەتیە ... ئامین .

وَآخِرُ دَعْوَانَا أَنِ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ

**مامۆستا خالد وەرمەزیار**

**پێشنوێژ و وتارخوێنی مزگەوتی شەهیدانی**

**گەرمیان / کەلار**

## دەسپێک و ڕێخۆشکاری :

باسێکی کورت لەسەر ترسناکی پرس و باسەکە ، و هۆکارەکانی دروستبوونی ...

**مانای کوفر و تەکفیر لە زمانەوانی و زاراوەدا :**

**وشەی** ( كَفَرَ ) **لە زمانەوانیدا :** بەواتای شاردنەوە و داپۆشین دێت ، وەك وتراوە : ( كَفَرَ الزَّارِعُ الْبَذْرَ فِي الأَرْضِ ، إِذَا غَطَّاهُ بِالتُّرَابِ ) ، واتە : جوتیارەکە تۆوەکەی لە زەویدا شاردەوە ئەگەر بە گڵ دای بپۆشێت . ( الْكُفْر ) : بەمانای دژی باوەڕ دێت ، و بە واتای : نکۆڵی لێکردوو و دانی پیانەنا و داپۆشین ونەچووە ژێرباریشەوە دێت ، وەك لە ڕستەی ( كَفَرَ نِعْمَةَ اللَّهِ ) . کەوابوو ( الْكُفْر ) بریتیە لە شاردنەوە و داپۆشین و نکۆڵی و ئینکار کردنی هەق .

کەواتە ( الْكَافِر ) بەواتای : بێباوەڕ و نکۆڵیکار لە بەخششەکانی خوا دێت .

( التَّكْفِيْر ) : فەتوایەکی فیقهیە بە مەبەستی حەلاڵکردنی خوێنی موسوڵمانێك یان زیاتر دەدرێت ، لەلایەن کەسانێکی تایبەتەوە ، و بەپێی کۆمەڵە مەرجێك ، و نەمانی ڕێگرییەکانی پێشی ئەو کارە .

پاشان دەبێت ئەوەش بزانین کە **جۆرەکانی** کوفر دوو جۆرن **( الكفر كفران )** ، ئەوانیش :

١ ـ **کوفری گەورە** ( الْكُفْرُ الأَكْبَرُ ) **:** واتە ئەوەی کە موسوڵمان لەئاینی ئیسلام دەرکات .

٢ ـ **کوفری بچووك** ( الْكُفْرُ الأَصْغَرُ ) **:** بەڵام ئەمەیان موسوڵمان لە ئیسلام ناباتە دەرەوە .

جۆری یەکەم لە جۆرەکانی کوفر و بێباوەڕی کوفری گەورەیە ( الْكُفْرُ الأَكْبَرُ ) ئەوەی کە خاوەنەکەی لە بازنەی ئیسلام دەباتە دەرەوە پێنج جۆرە ، **ئەوانیش :**

١ ـ **کوفری بە درۆخستنەوە** [ كُفْرُ التَّكْذِيْب ] **:** بەڵگەکەشی وتەی خوای پەروەردگارە کە فەرمویەتی : ﴿ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَى عَلَى اللَّهِ كَذِبًا أَوْ كَذَّبَ بِالْحَقِّ لَمَّا جَاءَهُ أَلَيْسَ فِي جَهَنَّمَ مَثْوًى لِّلْكَافِرِينَ ﴾ [ العنكبوت : ٦٨ ] ، واتە : چ کەسێك لەوە ستەمکارترە کە درۆ بە ناوی خواوە هەڵدەبەستێ ، یان کاتێ هەقی بۆ هات بە درۆی دەزانێ ؟ ئایا جێگای بێباوەڕان جەهەننەم نییە ؟!

٢ ـ **کوفری ملکەچ نەبوون و خۆ بەگەورە زانین** [ كُفْرُ الإِبَاء وَالاسْتِكْبَار ] **:** بەڵگەش وتەی خوای پەروەردگارە کە فەرموویەتی : ﴿ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلاَئِكَةِ اسْجُدُواْ لآدَمَ فَسَجَدُواْ إِلاَّ إِبْلِيسَ أَبَى وَاسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ الْكَافِرِينَ ﴾ [ البقرة : ٣٤ ] ، واتە : کە بە فریشتەکانم وت سوژدەبەرن بۆ ئادەم ، هەموو جگە لە ئیبلیس نەبێت سوژدەیان بۆ برد ، ئیبلیسیش بەو کارەی بێ فەرمانی خوای پەروەرگاری کرد و ملکەچ نەبوو و خۆی بەگەورە زانی ، بۆیە بوو بە یەکێ لە بێباوەڕان .

**٣ ـ کوفری دوودڵی و گومان** [ كُفْرُ الشَّكِّ ] : بەڵگە ئەم جۆرە کوفرە وتەی خوای پەروەردگارە کە فەرموویەتی : ﴿ وَدَخَلَ جَنَّتَهُ وَهُوَ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِ قَالَ مَا أَظُنُّ أَن تَبِيدَ هَذِهِ أَبَدًا ﴿٣٥﴾ وَمَا أَظُنُّ السَّاعَةَ قَائِمَةً وَلَئِن رُّدِدتُّ إِلَى رَبِّي لَأَجِدَنَّ خَيْرًا مِّنْهَا مُنقَلَبًا ﴿٣٦﴾ قَالَ لَهُ صَاحِبُهُ وَهُوَ يُحَاوِرُهُ أَكَفَرْتَ بِالَّذِي خَلَقَكَ مِن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ سَوَّاكَ رَجُلًا ﴿٣٧﴾ ﴾ [ الكهف : ٣٥ ـ ٣٧ ] ، واتە : کاتێ لەگەڵ هاوڕێ باوەڕدارەکەی چوو بۆ ناو باخ و بێستانەکەی و لەو کاتەدا ستەمکاربوو زوڵمی لەخۆی کرد بە هۆی بێباوەڕی ، وتی : من لەو بڕوایەدا نیم کە هەرگیز ئەم باغ و باغاتە لە ناو بچن ، و لەو بڕوایەشدا نیم کە ڕۆژی دوایی هەبێت ، و من دڵنیام ئەگەر دوای مردن زیندوو بکرێمەوە و بگەڕێمەوە لای خوا بێگومان ئەو کاتە بەهەشت و باخی زیاترم دەست دەکەوێت ، لەو کاتەدا هاوەڵە باوەڕدارەکەی پێی وت : تۆ بێباوەڕ بوویت بەو خوایەی کە تۆی لە خۆڵ دروست کردووە پاشان لە دڵۆپە ئاوێك ، و دواتریش ڕێکی خستووی و کردووتی بە پیاوێکی تەواو .

**٤ ـ کوفری ڕوو وەرگێڕان** [ كُفْرُ الْإِعْرَاضِ ] : بەڵگەی وتەی خوای پەروەردگارە کە فەرموویەتی : ﴿ وَالَّذِينَ كَفَرُوا عَمَّا أُنذِرُوا مُعْرِضُونَ ﴾ [ الأحقاف : ٣ ] ، واتە : ئەوانەی کە بێباوەڕن ڕوو لە ئایین وەردەگێڕن ـ لەوەی لێی ترسێنراون ـ .

**٥ ـ کورفی دووڕوویی** [ كُفْرُ النِّفَاقِ ] : بەڵگەی ئەمە وتەی خوای پەروەردگارە کە فەرموویەتی : ﴿ ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ آمَنُوا ثُمَّ كَفَرُوا فَطُبِعَ عَلَى قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَفْقَهُونَ ﴾ [ المنافقون : ٣ ] ، واتە : ئەمە لەبەر ئەوەیە کە لە پێشدا باوەڕیان هێناوە پاشان کافربوون و لەسەری بەردەوام بوون بۆیە خوای گەورە مۆری کوفری دا بەسەر دڵیاندا ، ئەوانە هەرگیز تێناگەن .

و جۆری دووەم لە جۆرەکانی کوفر و بێباوەڕی کە کوفری بچووکە ( الْكُفْرُ الْأَصْغَرُ ) مرۆڤ لە ئیسلام ناباتە دەرەوە ، ئەمەیان بریتیە لە کوفری نیعمەت ، بەڵگەش لەسەری وتەی خوای پەروەردگارە کە فەرموویەتی : ﴿ وَضَرَبَ اللّهُ مَثَلاً قَرْيَةً كَانَتْ آمِنَةً مُّطْمَئِنَّةً يَأْتِيهَا رِزْقُهَا رَغَدًا مِّن كُلِّ مَكَانٍ فَكَفَرَتْ بِأَنْعُمِ اللّهِ فَأَذَاقَهَا اللّهُ لِبَاسَ الْجُوعِ وَالْخَوْفِ بِمَا كَانُواْ يَصْنَعُونَ ﴾ [ النحل : ١١٢] ، واتە : خوا نموونەیەکی هێناوەتەوە مەڵبەندێکی ئەمان کە لە ئەمن و ئەمان و ئاسایشدا بووە و هەمیشە رزق و ڕۆزییەکی زۆری لە هەموو لایەکەوە بۆ دەهات جا ناشوکری و ناسزایی نیعمەتەکانی خوایان کرد ، بۆیە خوای گەورە پۆشاکی قات و قڕی و برسێتی و ترسی لەبەر کردن .

و بەڵگەی فەرموودەش لەسەر ئەم جۆرەی کوفر ، فەرموودەی ( ابْنُ عُمَر ) ـە ـ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا ـ کە فەرموویەتی : من بیستومە لە پەیامبەری خوا ﷺ فەرموویەتی (( مَنْ حَلَفَ بِغَيْرِ اللَّهِ ، فَقَدْ كَفَرَ ، أَوْ

أَشْـرَكَ )) [(١)] ، واتە : هەرکەسێك سوێند بە غەیری خوا بخوات ئەوا کوفری کردووە ، یان : هاوەڵی بۆ خوای پەروەردگار ئەنجامداوە .

پێشەوا ( الطَّحَاْوِي ) .رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى. سەبارەت بەم بەم فەرموودەیە فەرموویەتی : مەبەست پێی ئەو جۆرە کوفر و هاوەڵبڕیاردانە نیە کە موسوڵمان لە ئایین دەباتە دەرەوە ، بەڵکو مەبەست پێی ئەوەیە کە نەدەبوو سوێند بە غەیری خوا بخوات ، وەك ئەوەی بڵێت : ئەوەی سوێندی بە غەیری خوا خواردووە ئەوەی کە سوێندی پێخواردووە وەك خوا لێکردووە ، بەوەش کردوویەتی بەهاوەڵی لەوەی کە سوێندی پێدەخورێت ، بەوەش کوفرێکی ئەنجامداوە نەك وەك ئەوەی کە بێباوەڕ بووبێت و لە ئیسلام چووبێتە دەروە [(١)] .

و ئەو فەرموودەیەش کە تێیدا هاتووە : (( سِبَابُ الْـمُسْلِمِ فُسُوقٌ ، وَقِتَالُهُ كُفْرٌ )) [(٣)] ، واتە : جنێودان بە موسوڵمان فاسقبوونە ، و شەڕ لەگەڵ کردنیشی کوفرە .

پێشەوا ( الْـحَاْفِظُ ابْنُ حَجَر ) .رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى. فەرموویەتی : ئەم فەرموودەیە هیچ بەڵگەیەکی تێدا نییە بۆ خەواریجەکان ، چونکە مەبەست پێی ڕووکەشی فەرموودەکە نیە بەڵکو مەبەست پێی ئەوەیە کە جەنگان لەگەڵ موسوڵمان تاوانی گەورەترە لە قسەپێکردنی ، بۆیە بە کوفر ناوی بردووە ، ئەگەرچی مەبەستی ئەو کوفرە نیە کە موسوڵمان لە ئایین دەردەکات ، هەروەکو لە بنەواکانی شەرێعەتدا هاتووە ، یان وشەی کوفری بۆ بەکارهێنراوە ، چونکە ئەو کارە کاری کافر و بێباوەڕەکانە ، و هەموو ئەمانەش بۆ ئاگادارکردنەوەیە لە گەورەیی ئەو تاوانە [(٤)] .

بەڵگەیەکی تریش فەرموودەی ( أَبو هُرَيْرَة ) یە رضي الله عنه کە دەگێڕێتەوە پەیامبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (( اثْنَتَاْنِ فِي النَّاْسِ هُمَاْ بِـهِمْ كُفْرٌ ؛ الطَّعْنُ فِي النَّسَبِ ، وَالنِّيَاْحَةُ عَلَى الْـمَيِّتِ )) [(٢)] ، واتە : دوو کردەوە هەن لە ئوممەتەکەمدا کوفرن نەك شوکر و چاکەکارین ، یان لە کردەوەی کافرانن ، ئەوانیش : تانەدانە لە ڕەچەڵەك و نەسەب ، و شیوەنکردن لەسەر مردوو ـ واتە : دەنگ بەرزکردمەوە و هات و هاوارکردن لەکاتی گریاندا ـ .

---

[(١)] والصحيحة ، برقم : ٢٠٤٢ ، و صحيح الترغيب والترهيب ، برقم : ٢٩٥٢ .

[(١)] ( مشكل الآثار ، للإمام الطحاوي : ١/ ٢٣٨ ) .

[(٣)] ( رواه البخاري ومسلم ) .

[(٤)] ( فتح الباري ، لابن حجر : ١/ ١٦٧ ) .

[(٢)] رواه مسلم .

**بابەتێکی پەیوەست بەم پرس و باسە ئەوەیە :** موسوڵمانان دەبێت بیروباوەڕی ئەهلی سوننە و جەماعە بەرامبەر خاوەن تاوانە گەورەکان ـ جگە لە هاوەڵبڕیاردا ، و بێباوەڕی ـ بزانن مە ئەوەیش ئەوەیە : ئەهلی سوننە و جەماعە هیچ کەسێك لە ئەهلی قیبلە بە هۆی کردنی تاوانەوە چەنێك زۆر و گەورەش بن ـ بە مەرجێك بەحەڵاڵیان نەزانیێت ـ بەکافر نازانن ، بە پێچەوانەی خەواریجە حەروریەکانەوە کە لە دونیا و دواڕۆژدا بەکافر و بێباوەڕیان دەزانن !!!

بەڵگەی ئەهلی سوننە و جەماعەش وتەی خوای پەروەردگارە کە فەرموویەتی : ﴿ قُلْ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا مِن رَّحْمَةِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ ﴾ [ الزمر : ٥٣ ] ، واتە : بەو بەندانەی خوا کە ئیسراف و ستەمتان لە خۆیان کردووە بڵێ : نەکەن لە ڕەحمەتی خوا بێ هیوا بن ، چونکە بێگومان خوای پەوەرەدگار لە هەموو تاوانێك خۆش دەبێت ، بەڕاستی هەر ئەو لێبووردە بەڕەحم و بەبەزەییە .

یان بەڵگە بەئایەتی : ﴿ إِنَّ اللّهَ لاَ يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَن يَشَاء ﴾ [ النساء : ٤٨ و ١١٦ ] ، دەهێننەوە ، کە واتاکەی بریتیە لە : بێگومان خوای پەروەردگار لەو کەسانە خۆش نابێت کە هاوەڵی بۆ ئەنجام دەدەن ، بەڵام جگە لەوە و لەوە کەمتر بۆ هەرکەسێك بیەوێت خۆش دەبێت .

و فەرموودەی : (( بَشِّرْ أُمَّتَكَ أَنَّهُ مَنْ مَاتَ لَا يُشْرِكُ بِاللَّهِ شَيْئاً دَخَلَ الْجَنَّةَ ، قُلْتُ : يَا جِبْرِيْلُ : وَإِنْ سَرَقَ وَإِنْ زَنَى ؟ قَالَ : نَعَمْ ، قُلْتُ : وَإِنْ سَرَقَ وَإِنْ زَنَى ؟ قَالَ : نَعَمْ ، قُلْتُ : وَإِنْ سَرَقَ وَإِنْ زَنَى ؟ قَالَ : نَعَمْ ، وَإِنْ شَرِبَ الْخَمْرَ )) [1] ، واتە : موژدە بدە ئوممەتەکەت کە هەر کەسێك بمرێ و هاوەڵی دانەنابێ بۆ خوا دەچێتە بەهەشتەوە ، منیش ووتم : ئەی حبریل : ئەگەر دزی بکات و زیناش بکات ؟ ووتی : بەڵێ ئەگەر دزی بکات و زیناش بکات ، ووتم : ئەگەر دزی بکات و زیناش بکات ؟ ووتی : بەڵێ ، ووتم : ئەگەر دزی بکات و زیناش بکات ؟ ووتی : بەڵێ ئەگەر ئارەقیش بخواتەوە .

پاش خستنەڕووی ئەم پێشەکیە با هەندێك لە پرس و باسەکانی تەکفیر بخەینە ڕوو ، لەوانەش : خستنەڕووی ڕێگا و بنەواکانی زانینی موسوڵمانێتی تاکەکانی کۆمەڵگا موسوڵمانان چییە ؟ خودی کۆمەڵگاکە لە ڕووی ئیسلامەتی کوفرەوە چۆن دیاری دەکرێت ؟

---

[1] رواه البخاري ومسلم .

## ڕێگا و بنەواكانی زانینی موسوڵمانێتی تاكەكانی كۆمەڵگا و چۆنێتی دیاریكردنی كۆمەڵگا لە ڕووی ئیسلامەتی و كوفرەوە

سەرەتا سەبارەت بە ڕێگا و بنەواكانی دیاریكردنی تاكەكانی كۆمەڵگا و حوكمدان بە موسوڵمانێتیان بە دوو ڕێگە دەبێت ، ئەوانیش :

**یەكەم : تاكەكە لە باوك و دێكێكی موسوڵمانەوە بێت .**

**دووەم : بە پێی گوفتار و ڕووكەشی كردارەكانی تاكەكە دەبێت .**

**بەڵگەی ئەم دوو ڕێگە و بنەوایەش ، لەم لێكدانەوەی خوارەوە ڕوون دەبێتەوە .**

**بەڵگە خاڵی یەكەم** فەرمودەی ( أَبو هُرَيْرَةَ ) یە ﷺ كە دەگێڕێتەوە پەیامبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (( مَاْ مِنْ مَوْلُودٍ إِلَّا يُولَدُ عَلَى الْفِطْرَةِ ، فَأَبَوَاْهُ يُهَوِّدَاْنِهِ ، أَوْ يُنَصِّرَاْنِهِ ، أَوْ يُمَجِّسَاْنِهِ ، [ فَإِنْ كَاْنَا مُسْلِمَيْنِ ، فَمُسْلِمٌ ] ، [ حَتَّى يُبَيِّنَ عَنْهُ لِسَانُهُ ] ، ... )) [١] ، واتە : هیچ لەمنداڵێك نییە كە لە دایك دبێت ئیللا لەسەر فیترەت و خواناسی لەدایك دەبێت ، بەڵام باوانی دەیكەن بە : جولەكە ، یان گاور ـ خاچ پەرست ـ ، یان مەجوسی ـ ئاگر پەرست ـ ، یان هاوەڵبڕیاردەر ، وەكو خۆیان ، بەهاندانیان بێت یان شوێنكەوتنیان بێت بۆیان ، بەڵام ئەگەر باوانیان موسوڵمان بن ئەوا ئەوانیش موسوڵمان دەبن ، تاكو ئەو كاتەی كە خۆی بەزمان ئاشكرای دەكات ، ... .

كەواتە : بنەوا و پێوەر بۆ دیاریكردنی موسوڵمانێتی تاكەكانی كۆمەڵگا و مافەكانیان و حوكمدان لەسەریان ئەوەیە كە لە باوك و دایكێكی موسوڵمانەوە بێت ، چونكە منداڵ حوكمەكەی حوكمی دایك و باوكی دەبێت تاكو ئەو كاتەی كە باڵغ دەبێت و خۆی گوزارش لە شتێكی تر دەكات .

پێشەوا ( الشَّاْفِعِي ) ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ لە ڕوونكردنەوەی فەرموودەكە فەرموویەتی : (( مەبەست پێی ئەو فیترەتەیە كە خوای پەروەردگار لەسەری دروستی كردوون ، و پەیامبەری خواش ﷺ ئەوەی بۆ داناون كە خۆیان لە خۆیاندا هیچ حوكمێكیان نیە بەڵكو حوكمیان حوكمی دایك و باوكیانە ، تاكو ئەو كاتەی كە خۆیان گوزارش دەكەن بە ووتەیەك لە وتەكان ـ باوەڕ یان كوفر ـ ، و بۆیە لەكاتی لەدایك بوونیان حاڵی باوانیان هەیە ، ئەگەر باوەڕداربوون ئەوانیش لەسەر باوەڕی ئەوان دەبن ، و ئەگەرش كافر بوون ئەمانیش لەسەر كافرێتی ئەوان دەبن ، بۆیە حوكمیان لە هاوسەرگیری و

---

[١] رواه البخاري ومسلم ، والزيادتان عند مسلم .

میراتگرێتی و ئەحکامەکانی دونیایان حوکمی باوانیان هەیە تاکو ئەو کاتە گوزارش لە ناخی خۆیان دەکەن بە یەکێك لەو دووە )) [١] .

و پێشەوا ( ابْنُ تَيْمِيَّة ) . رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى . فەرموویەتی : (( مندالْ حوکمی لە ئەحکامە دونیاویەکان حوکمی دایك و باوکیەتی ، لەبەر ئەوەی خۆی بۆ خۆی سەربەخۆ نابێت ، جا کە بالْغ بوو و دانی نا بە ئیسلامدا ، یان کوفری هەلْبژارد ، ئەو کاتە حوکمەکەی بەپێی خۆی دەبێت ، ئەمەش بە کۆ دەنگی موسولْمانان ، ... )) [٣] .

**ئەما بەلْگەی لەسەر خالْی دووەم** ، خوای پەروەردگارە فەرموویەتی : ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا ضَرَبْتُمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَتَبَيَّنُوا وَلَا تَقُولُوا لِمَنْ أَلْقَى إِلَيْكُمُ السَّلَامَ لَسْتَ مُؤْمِنًا ... ﴾ [ النساء : ٩٤ ] ، واتە : ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ئەگەر دەرچوون بۆ جیهاد و تێکۆشان لەپێناو خوای پەروەردگار ، ئەوا بەباشی بکۆلْنەوە و بەئاگا بن لەحالْی ئەو خەلْکانەی پێیان دەگەن ، و نەکەن باوەڕ لەکەسێك دابمالْکێنن کە شتێك لە نیشانەکانی موسولْمانبوونی لێدەرکەوت و خۆی بە یەکێك لە ئێوە ئەژمار دەکرد ، چونکە لەوانەیە باوەڕەکەی شاردبێتەوە [١] .

سەبارەت بە هۆکاری هاتنەخوارەوەی ئەم ئایەتە هاوەلْی بەڕێز ( ابْنُ عَبَّاس ) . رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا . فەرموویەتی : (( لە یەکێك لە غەزاکاندا پیاوێك لە هۆزی سولەیم کە مەڕ و مالاتێکی پێبوو بەلای کۆمەلْێك لە هاوەلاْنی پەیامبەری خوادا ﷺ تێپەڕبوو ، و سەلامی لێکردن و وتی : ( السَّلَامُ عَلَيْكُمْ ) ، ئەوانیش وتیان : ئەوە بۆیە سەلامی لێکردن بۆ ئەوەی خۆی بەسەلامەکە بپارێزێت و نەیکوژن ، بۆیە هەستان و کوشتیان ، و مەڕ و مالاْتەکەیان برد ، و بردیان بۆ لای پەیامبەری خوا ﷺ ، لەو کاتەدا خوای پەروەردگار ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە کە تێیدا فەرموویەتی : ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا ضَرَبْتُمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَتَبَيَّنُوا وَلَا تَقُولُوا لِمَنْ أَلْقَى إِلَيْكُمُ السَّلَامَ لَسْتَ مُؤْمِنًا ... ﴾ [ النساء : ٩٤ ] )) [٢] .

---

[١] ( الاعتقاد للبيهقي ، ص ١٦٥-١٦٦ ، والسنن الكبرى ، لهم ، برقم : ١٢١٤٣ ) .

[٣] مجموع الفتاوى ، لابن تيمية : ٣٥ / ٢٢٦ - ٢٢٧ .

[١] بڕوانە تەفسیری : ( الطبري : ٩ / ٧٠ - ٧١ ) ، و ( ابن كثير : ١/ ٦٦٦ - ٦٦٧ ) ، و جگە لەوانیش .

[٢] رواه البخاري ومسلم .

لەمە دەردەكەوێت ئایەتەكە نەهییەكی ڕوونە لەوەی كە ئیسلامەتی كەسێك وەرنەگرین كە خۆی وا دەرخات موسوڵمانە یان شتێك لە دروشمەكانی ئایینی دەردەبڕێت ـ ئەمە ئەگەر لەكاتی جیهاد و تێكۆشان بێت و بەرامبەرەكەش كافر بێت ـ ، بەڵكو دەبێت حوكمی ئیسلام و موسوڵمانێتی لێوەربگیرێت ، و نابێت بەگومان تەكفیر بكرێت و حوكمی بێباوەڕ و كافری بەسەردا بدرێت بەهەر بیانویەك بێت ، ئەگەرچی ئەو بیانوەش ئەگەری هەبێت لەو حاڵ و بارەی ئەودا .

پێشەوا ( الشَّوْكَانِي ) ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ فەرموویەتی : (( واتە : بەو كەسەی كە بە وتنی شایەتومان ئیسلامەتی خۆی خستڕوو مەڵێن تۆ موسوڵمان نیت ، یان وتراوە : بەوەی كە سەلامی ئەهلی ئیسلامی لێكردن ، و وتی : ( السَّلَامُ عَلَيْكُمْ ) مەڵێن تۆ باوەڕدار نیت ، مەبەست لە ئایەتەكە قەدەغەكردنی ئەوەیە لە موسوڵمانان كە ئەوە بێنرخ بكەن كە كەسانی كافر دەری دەبڕن و نیشانە و بەڵگەیە لەسەر موسوڵمانێتیان ، بڵێن : ئەوە تەنها لەبەر ئەوەیە كە بۆ خۆپارێزی لە كوشتن و بە ڕووكەش و درۆوە ئەوەی وتووە )) [٣] .

و پێشەوا ( الْبَغَوِي ) ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ فەرموویەتی : (( لەم فەرموودەدا بەڵگەی ئەوە هەیە كە كار و باری خەڵكی لە هەڵسوكەوتیان لەگەڵ یەكدا ، تەنها لەسەر ڕووكەشی بار و حاڵیان دەبێت نەك بەپێی ناوەڕۆك و دڵیان ، و بێگومان ئەوەش كە دروشمەكانی ئاینی دەربڕی ئەوا حوكمی ئەوەی لەسەر جاری دەبێت ، و بەدوای ناخ و دەروونی ناگەڕێن )) [٤] .

و شێخ ( مُحَمَّد ) ـی كوڕی ( عَبْدالْوَهَّاب ) یش ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ فەرموویەتی : (( بێگومان ئەوەی كە یەكتاپەرستی و ئیسلامی دەربڕێت ئەوا پێویستە وازی لێبهێنرێت تاكو ئەو كاتەی كە شتێكی لێدەوەشێتەوە و ئاشكرا دەبێت كە ئەوانە پوچەڵدەكاتەوە )) [٥] .

و بەڵگەی سوننەتیش لەسەر ئەم وتەیە زۆرن ، لەوانە فەرموودەی ( ابْنُ عُمَر ) ـە ـ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا ـ كە دەگێڕێتەوە : پەیامبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (( أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ ، حَتَّى يَشْهَدُوا أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ ، وَأَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللَّهِ ، وَيُقِيمُوا الصَّلَاةَ ، وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ ، فَإِذَا فَعَلُوا ذَلِكَ ، عَصَمُوا مِنِّي

---

[٣] ( فتح القدير ، للشوكاني : ١/ ٥٠١ ) .

[٤] ( شرح السنة ، للبغوي : ١ / ٧٠ ) .

[٥] ( كشف الشبهات ، للشيخ محمد بن عبدالوهاب : ٤٩ ) .

دِمَاْءَهُمْ وَأَمْوَاْلَـهُمْ إِلَّا بِحَقِّ الإِسْلَامِ ، وَحِسَاْبُـهُمْ عَلَـى اللَّـهِ )) (١) ، واتە : فەرمانم پێكراوە كە لەگەڵ خەڵكانی بێباوەڕدا بجەنگێم ـ ئەوەش پاش خستنەڕووی ئیسلام و بانگەشەكردنیان بۆی ـ ، تاكو شایەتی دەدەن بە (( لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّـهُ ، وَمُـحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّـهِ )) و دانی پێدا دەنەن ، و نوێژەكانیان بكەن ، زەكاتی ماڵ و سامانەكەیان بدەن ، جا ئەگەر ئەوەیان ئەنجامدا ، بەوەش خوێن و ماڵ و سامانیانم لەسەر حەرام و قەدەغە دەكەن و دەیپارێزن ، ئیللا ئەگەر كردەوەیەك بكەن سزادانیان پێویست بكات ، ئەگەرنە لێپرسینەوەیان ـ لەوەی كە لە دەروون و ناخیاندا هەیە ـ بۆ لای خوای پەروەردگارە .

كەواتە مادام كەسەكە شایەتومانی هێناوە پێویستە لەسەر ئێمە ڕووكەشی كەسەكە وەرگرین ، و پەنهانی و ناو دڵی بۆ لای خوای پەروەردگارە بەجێ بهێنین ، پێشەوا ( الْقَاضِـي عِيَاض ) ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ فەرموویەتی : (( پاراستنی خوێن و ماڵ و سامانی یەكلا بە شایەتومان دەبێت ، ئەوەش هەڵناگیرێت ، و پێچەوانەكەی حەڵاڵ ببێت ئیللا بە یەكلاكارێكی تر نەبێت ، یەكلاكاریش نیە ئیللا ئەوە نەبێت لە شەرعدا هاتووە ، و قیاسیشی لەسەر ناكرێت )) (٢) .

و پێشەوا ( ابْن حَجَر ) ـیش ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ فەرموویەتی : (( فەرموودەكە بەڵگەی تێدایە لەسەر ئەوەی كە دەبێت كردەوە ڕووكەشەكان وەرگرین ، و حوكمدانمان بەپێی ئەوە بێت كە ڕووكەشی كەسەكە خوازیاریەتی )) (١) .

بەڵگەیەكی تر لە فەرموودەكانی پەیامبەر ﷺ فەرموودەی ( أَنَسِ ) ـی كوڕی ( مَالِك ) ـە رضي الله عنه كە دەگێڕێتەوە : پەیامبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (( مَنْ صَلَّـى صَلَاتَنَاْ ، وَاسْتَقْبَلَ قِبْلَتَنَاْ ، وَأَكَلَ ذَبِيحَتَنَاْ ، فَذَلِكَ الْـمُسْلِمُ الَّذِي لَهُ ذِمَّـةُ اللَّـهِ وَذِمَّةُ رَسُولِهِ ، فَلَا تُـخْفِرُوا اللَّـهَ فِـي ذِمَّتِهِ )) (١) ، واتە : ئەو كەسەی نوێژەكەی ئێمە بكات ، و ڕوو لە قیبلەمان بكات ، و سەربڕاومان بخوات ـ ئاماژەیە بە جولەكەكان كە سەربڕاوی موسوڵمانان ناخۆن ـ ، ئەوە موسوڵمانە و ئەمانەت و پەیمانی خوای پەروەردگاری بۆ هەیە ، جا نەكەن خیانەت لە ئەمانەت و پەیمانی خوای پەروەردگار بكەن .

---

(١) رواه البخاري ، ومسلم .

(٢) ( الشفا بتعريف حقوق المصطفى ، محذوف الأسانيد : ٢ / ٥٩٦ ) .

(١) ( فتح الباري ، لابن حجر : ١/ ٤١ ) .

(١) رواه البخاري .

کەواتە ئەو کەسەی کە ئەم کردارانەی سەرەوەی لێوەشایەوە و ئەنجامی دان ، کە جگە لە موسوڵمانانی ئەهلی قیبلە نەبێت کەسی تر ئەنجامیان نادەن ، ئەوا دەبێت حوکمی ئێمە بەرامبەری ئیسلامەتی و موسوڵمانێتی بێت لەسەر ڕووکەشی ، و هەموو مافێکی موسوڵمانێتی پێبدەین ، و نهێنی و پەنهان و ناو دڵی بهێلینەوە بۆ خوای پەروەردگار .

خاوەن پەرتوکی ( عَوْنُ الْـمَعْبُود ) فەرموویەتی : (( بێگومان کاروباری خەڵکی بەپێی ڕووکەش و دەرەوەیانە ، بۆیە ئەو کەسەی کە دروشمەکانی ئایینی دەرخست ، ئەوا ئەحکامی ئەهلی ئایین و ئیسلامی بەسەردا دەدرێت ، تاکو ئەو کاتەی پێچەوانەی ئەوەی لێدەرنەکەوێت )) [٢] .

و شێخ ( ابْنُ الْعُثَيْمِيْـن ) یش ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ فەرموویەتی : (( بنەوا لەو کەسەی کە نیسبەتی خۆی دەداتە پاڵ ئیسلام مانەوەی ئیسلامەتییەتی تاکو نەمانی ئەوە جێبەجێ دەبێت بە پێی بەڵگە شەرعیەکان ، و نابێت کەمتەرخەمی و ئاسانکاری بکرێت لە تەکفیرکردنیدا ... )) [٤] .

بەڵکو شێخ ( عَبْدُاللَّطِيْفِ بْنُ عَبْدِالرَّحْمَنِ بْنِ حَسَنِ بْنِ مُحَمَّـدِ بْنِ عَبْدِالْوَهَّـاْبِ ) ـ رَحِمَهُمُ اللَّهُ تَعَالَى ـ دەستوەردان لە تەکفیرکردنی کەسانێك کە ڕووکەشیان موسوڵمانێتیە بە بێ هیچ بەڵگەیەکی دروستی شەرعی بە پێچەوانەبوونەوەی پێشەوایان و زانایانی ئەهلی سوننە و جەماعە زانیوە ، بەڵکو ئەو بۆچوونەی بە ڕێچکە و ڕێبازی بیدعەکاران و گومڕایانێك داناوە کە هیچ ترس و تەقواکاریەکی نەمابێت لەوەی کە لێیدەکەوێتەوە لە گوفتار و کرداریدا [٣] .

بەڵگەیەکی تریش هەر لە بەڵگەکانی ئەم بنەوایە فەرموودەی ( الْـمِقْدَاْد ) ـی کوڕی ( الْأَسْوَد ) ـە رضي الله عنه کە فەرموویەتی : وتم بە پەیامبەری خوا ﷺ : ئەی پەیامبەری خوا ﷺ ! ئایا چۆن دەبینیت ئەگەر ڕووبەڕووی کەسێك بوومەوە لە بێباوەڕان ، و بەشەرهاتین ، و بەشیرەکەی لە دەستێکی دام و دەستی بڕیم : پاشان خۆی لەپشت دارێك حەشاردا ، و وتی : باوەڕم بە خوا هێنا و هاتمە ناو ئیسلامەوە ، ئایا ـ ئەی پەیامبەری خوا ﷺ ـ پاش ئەوەی کە ئەوەی وت بیکوژم ؟ پەیامبەری خواش ﷺ فەرمووی : نەخێر مەیکوژە ، منیش پێم وت : ئەی پەیامبەری خوا ﷺ ئەو دەستێکی بڕیوم ، پاش ئەوەش کە دەستی بڕیم ئەوە دەڵێت ! ئایا بیکوژم ؟ پەیامبەری خوا ﷺ فەرمووی : نەخێر مەیکوژە ،

---

[٢] ( عون الـمعبود : ٦ / ٧٠ ) .

[٤] ينظر : ( مـجموع فتاوى ورسائل العثيمين ، جـمع فهد السليمـان : ٢ / ١٣٣ ) .

[٣] ينظر : ( الدرر السَّنيَّة : ١٠/ ٤٢٣ ـ ٤٢٥ ) ، وكلام شيخ الإسلام في ( مـجموع الفتاوى : ١٩/ ٢٠٣ ) .

چونکە ئەگەر تۆ ئەو بکوژیت ، ئەوا ئەو وەکو تۆ دەبێت پێش ئەوەی بیکوژیت ، و تۆش وەکو ئەو دەبیت پێش ئەوەی ئەو وتەیەی بڵێت کە وتویەتی [٣] .

مانای ئەوەی کە فەرموویەتی : ( وەکو تۆ دەبێت ) ، واتە : لەوەدا کە خوێنی پارێزراو دەبێت ، و ئەوەی بیکوژێت دەبێت بکوژرێتەوە وەکو سنورێکی شەرعی ، و واتای ئەوەی فەرموویەتی : ( وەکو ئەو دەبیت ) واتە : چۆن خوێنی ئەو حەڵاڵ بوو خوێنی تۆش حەڵاڵ دەبێت ، چونکە لەبەر ئەوەی موسوڵمانێکت کوشتوە وەك سنورێکی شەرعی دەکوژرێتەوە ، پێشەوا ( الشَّافِعِيُّ ) ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ سەبارەت بە واتای فەرموودەکە فەرموویەتی : (( بەو کارەی خوێنی حەڵاڵ دەبێت ، نەك ئەوەی ببێت بە کافر ، هەروەکو چۆن پێش وتنی شایەتومان خوێنی حەڵاڵ بوو )) [٢] .

و هەر پێشەوا ( الشَّافِعِي ) ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ لەم پرس و باسەدا فەرموویەتی : (( بۆ هیچ کەسێك نیە حوکم لەسەر کەسێك بدات بە پێچەوانەی ئەوەی دەریدەخات لە خۆیدا ، و خوای پەروەردگار ئەوەی بۆ بەندەکان هێشتووەتەوە کە حوکم لەسەر ئەوە بدەن کە دەری دەخات ، چونکە هیچ بەندەیەك نیە ئەوە بزانێت کە پەنهان و نادیارە جگە لە خوای پەروەدگار نەبێت ، بۆیە پێویستە لەسەر هەموو ئەوانەی کە تێگەیشتوون لە داواکاریەکانی خوای پەروەردگار هەموو جۆرە گومانێك پەك بخەن بەلاوەی بنێن ، و بە گومان حوکم لەسەر کەس نەدەن ، هەر ئەمەشە واتای فەرموودەکانی پەیامبەری خوا ﷺ ، و هیچ جیاوازیەکیان لە نێواندا نییە )) [٢] .

پێشەوا ( النَّوَوِيُّ ) یش ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ لەسەر فەرموودەکەی ( أُسَامَة رضي الله عنه ) کە هاوشێوەی ئەو فەرمودانەیە کە پێشتر خراونەتەڕوو فەرموویەتی : ئەم فەرموودەیە بەڵگەی ئەو بنەوا و ڕێسا زانراوەی تێدایە کە لە فیقهو ئوصولدا باسی لێوە دەکرێت : (( إِنَّ الأَحْكَامَ يُعْمَلُ فِيْهَا بِالظَّاهِرِ ، وَاللَّهُ يَتَوَلَّى السَّرَائِرَ )) [٤] ، واتە : بێگومان مامەڵەکردن لە ئەحکامەکاندا بەپێی ڕووکەش و ئەوەیە کە ئاشکرایە ، و پەنهان و ناو دڵەکانیش بۆ لای خوای پەروەردگارە .

---

[٣] ( رواه البخاري ، برقم : ٤٠١٩ ، مسلم ، برقم : ١٥٥ ـ (٩٥) ، والزيادة من لفظ مسلم ) .

[٢] ( مناقب الشافعي ، للبيهقي : ١ / ؟؟؟ ) .

[٢] ( الأم ، للشافعي : ٦ / ١٩٦ ـ ١٧٠ ) .

[٤] ( شرح النووي على صحيح مسلم : ٢ / ٤٦٦ ) .

**پاش خستنەڕووی** پێوەر و بنەواکان بۆ زانینی موسوڵمانێتی تاکەکانی کۆمەڵگا موسوڵمانان ، **با بزانین پێشەوایان و زانایانی ئیسلام چۆن کۆمەڵگای موسوڵمانانیان دیاری کردووە و چییان کردووەتە پێوەر بۆ ئەو دیاریکردنە ؟**

پێشەوایان و زانایانی ئیسلام پێوەر و بنەوای دیاریکردنی کۆمەڵگای موسوڵمان ـ واتە : دار الإسلام ـ یان بەپێی دەرکەوتنی دروشمە شەرعی و ئیسلامییەکان داناوە ، وەك : بانگدان و نوێژی بەکۆمەڵ و نوێژی هەینی و ... هتد .

بەڵگەی ئەم بنەوایەش فەرمودەی ( أَنَسِ ) ـی کوڕی ( مَالِك ) ﷺ کە دەگێڕێتەوە پەیامبەری خوا ﷺ : (( إِذَاْ غَزَا بِنَاْ قَوْماً ، لَمْ يَكُنْ يَغْزُو بِنَاْ حَتَّى يُصْبِحَ وَيَنْظُرَ ، فَإِنْ سَمِعَ أَذَاْناً كَفَّ عَنْهُمْ ، وَإِنْ لَمْ يَسْمَعْ أَذَاْناً أَغَاْرَ عَلَيْهِمْ ، ... )) [١] ، واتە : پەیامبەری خوا ﷺ ئەگەر بیویستایە غەزای پێبکردبایەین دژ بە خەڵکێك ، غەزاکەی پێنەدەکردین تاکو لەکاتی بەرەبەیاندا دەیڕوانی ، جا گەر گوێبیستی بانگ ببابە ئەوا وازی لێدەهێنان ، بەڵام ئەگەر گوێبیستی بانگیان نەبایە غەزای دەکردن دژیان تێدەکۆشا .

پێشەوا ( النَّوَوِي ) ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ فەرموویەتی : (( لە فەرموودەکەدا بەڵگەی ئەوە هەیە کە بانگدان ڕێگرە لە هێرشکردنە سەر خەڵکی ئەو ناوچەیە ، چونکە بێگومان بەڵگەی ئیسلام بوون و موسوڵمانێتیانە )) [٤] .

و پێشەوا ( ابْنُ تَيْمِيَّة ) ـەش ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ فەرموویەتی : (( یەکێك لە بەڵگەکان : دروشمەکانە : وەکو دروشمە ئاشکراکانی ئیسلام ، کە بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە کۆمەڵگاکە کۆمەڵگای ئیسلام و موسوڵمانانە ، وەك : بانگدان ، و نوێژە هەینیەکان ، و ئەنجامدانی نوێژە جەژنەکان ، لە هەردوو پەرتوکی صحیحی پێشەوا بوخاری و موسلیمدا لە ( أَنَس ) ـەوە ﷺ هاتووە دەگێڕێتەوە : پەیامبەری خوا ﷺ ئەگەر بیویستایە غەزا دژ بە خەڵکێك بکات ، ئەو غەزای نەدەکرد تاکو کاتی بەرەبەیان ، جا ئەگەر گوێبیستی بانگ ببابە ئەوا وازی لێدەهێنان ، بەڵام ئەگەر گوێبیستی بانگیان نەبایە غەزای دەکردن لەو کاتەدا و تێدەکۆشا دژیان )) [١] .

---

[١] رواه البخاري ، برقم : ٦١٠ ، والزيادة صححه الأرناؤوط في تحقيقه لمسند أَحْمَد ، برقم : ١٣٧٧١ .

[٤] ( شرح النووي على صحيح مسلم : ٤/٣٠٦ ) .

[١] ( النبوات ، لابن تيمة : ٢ / ٧٦٠ ) .

و پێشەوا ( ابْنُ رَجَبِ الْحَنْبَلِيِّ ) . رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى . سەبارەت بە سودەکانی فەرموودەکە فەرموویەتی : لەو سودانەش ـ کە مەبەستی ئەم پرس و باسەیە ـ ئەوەیە : کە بانگدان دەکرایە جیاکار لە نێوان کۆمەڵگای بێباوەڕێتی و کۆمەڵگای ئیسلام و موسوڵمانان ، چونکە ئەگەر گوێبیستی بانگدەرێکی کۆمەڵگاکە ببایە وەکو حوکمدان بوو بەوەی کە کۆمەڵگاکە کۆمەڵگای ئیسلام و موسوڵمانانە ، و ئەگەر گوێبیستی بانگدان نەبوایە ئەوا هێرشی دەکردە سەریان و غەزای دژیان دەکرد پاش ئەوەی کە ڕۆژی بکردایەتەوە )) [٢] .

و پێشەوا ( ابْنُ عَبْدِالْبَرِّ ) . رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى. فەرموویەتی : (( بێگومان ئەوە ـ واتە : بانگدان ـ یەکێکە لە نیشانەکان کە بەڵگەی جیاکاری نێوان کۆمەڵگای ئیسلام و موسوڵمانانە لە کۆمەڵگای بێباوەڕی و کوفر )) [٣] .

و پێشەوا ( أَبُو بَكَر الْإِسْمَاعِيْلِيُّ ) . رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى . سەبارەت بە بنەواکانی ئەهلی سوننە و جەماعە فەرموویەتی : (( ئەهلی سوننە و جەماعە کۆمەڵگاکە بە کۆمەڵگای ئیسلام و موسڵمانان دەزانن نەك کۆمەڵگای بێباوەڕی کوفر بێت مادام بانگدان و قامەتی تێدایە بۆ نوێژەکان ئاشکرایە ، و خەڵکەکەی دەستی باڵایان هەیە تێدا و بە ئەمن و ئەمان تێیدا دەژین ـ نەك وەك ئەوەی کە بۆچوونی موعتەزیلەکان بووە ـ )) [٤] .

شێخ ( ابْنُ بَاْز ) ـیش . رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى. لەم پرس وباسەدا فەرموویەتی : (( ئەگەر دروشمەکانی کوفر و بێباوەڕی تێدا ئاشکرا و زاڵبوو ، ئەوا کۆمەڵگاکە کۆمەڵگای کوفر و بێباوەڕیە ، و ئەگەریش دروشمەکانی ئیسلامی تێدا ئاشکرا و زاڵبوو ، ئەوا کۆمەڵگاکە کۆمەڵگای ئیسلام و موسوڵمانانە ، ئەوەش بەپێی ئەوەی کە ئاشکرا و زاڵ و زۆرینیە تێیدا )) [٢] .

و پێشەوا ( مُحَمَّد نَاْصِرُالدِّيْنِ الْأَلْبَاْنِي ) ـش . رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى. فەرموویەتی : (( هەر هەرێمێك موسوڵمانان زۆرینەبن تێیدا ، ئەگەرچی کاربەدەستانیشی حوکم بە جگە لەوە بکەن کە خوای پەروەردگار

---

[٢] ( فتح الباري ، لابن رجب : ٣ / ٤٤٠ ) .

[٣] ( الاستذكار ، لابن عبدالبر : ١ / ٣٧١ ) .

[٤] ( اعتقاد أئمة الحديث ، للإسماعيلي : ١/ ٧٦ ) .

[٢] ( الموقع الرسمي لسماحة الشيخ ابن باز . رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى . ) .

دابیەزاندووە ـ لە هەموو حوکمەکانیاندا یان لە بڕێکدا ـ ، ئەوا هیچ زیانێك بە موسوڵمانێتی هەرێمەکە ناگەیەنێت ، و ئەو گەڵەش دەرناچن لەوەی کە گەلێکی موسوڵمانن ، ... )) [٣] .

و فەرموویەتی : (( لەمەرجەکانی ئەوەی کە وڵات وڵاتی ئیسلامی بێت ئەوە نییە کە کاربەدەست تێیدا حوکم بە ئیسلام بکات ، چونکە لەوانەیە هەندێك وڵات دەسەڵاتی بەسەردا بگرن ، هەروەك لە دێری زەمانەوە بۆ فەلەستین و هەندی وڵاتی تر وەکو سوریا و ئەردەن و جگە لەوانیش ڕوویداوە کاتێك کە داگیرکاری ئینگلیزی یان فەرەنسی حوکمیان کردووە ، کەچی ئەو وڵاتانە لەوە دەرنەچوون کە وڵاتی ئیسلام بن ، ئەگەرچی کاربەدەستانیان کافر و داگیرکاربووە ... )) [٢] .

و پێشەوا ( ابْنُ عُثَيْمِيْنُ ) ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ فەرموویەتی : کۆمەڵگای موسوڵمان ئەو کۆمەڵگایەیە کە دروشمە ئیسلامیەکان تێیدا بەرپا دەکرێت ، بە بێ ڕوانینە کاربەدەستانیان ، تەنانەت ئەگەر کەسێکی کافریش بەڕیوە ببات ، بۆیە ئەوەی کە دروشمەکانی ئیسلامی تێدا ئاشکرایە ، ئەوا کۆمەڵگای موسوڵمانانە ، مادام بانگی تێدا دەدرێت ، و نوێژەکانی تێدا ئەنجام دەدرێت ، و هەینیەکانی تێدا ئەنجام دەدرێت ، جەژنە شەرعیەکانی تێدا بەڕیوە دەچێت ، و ڕۆژوو و حەج و هاوشێوەکانی ئەوانە ، ئەوە کۆمەڵگای موسوڵمانانە ، ئەگەر تەنانەت کاربەدەستانی کافریش بن ، ... .

بەڵام وتەی ئەوەی کە دەڵێت : کۆمەڵگای موسوڵمانان ئەوەیە کە موسوڵمانتان حوکمی دەکەن ـ واتە کاربەدەستانی موسوڵمانن ـ !!! ، ئەم وتەیە دروست نییە ، چونکە ئەگەر ئەم وتەیە لە واقعی ئەمڕۆی موسوڵمانان پیادە بکەین ، چەند وڵات وڵاتی ئیسلامی دەبێت ؟! لەوانەیە وڵاتێك یان دوو !! خوا زاناترە لە هەموان ، بەهەر حاڵ ئەم وتەیە نادروستە [١] .

---

[٣] ( جامع تراث العلامة الألباني في المنهج والأحداث الكبرى : ٩ / ١٠٦ ) .

[٢] ( فتاوى جدة ، للألباني ، ص ٢١ ، السؤال : ١٢ ) .

[١] ( أشرطة التفسير : الدقيقة : ٢٦ ، من الشريط : ١٣ ) .

## تەکفیرکردن مافی کێیە ،
## و کێ پێی هەڵدەستی ؟ لەسەر کێ قەدەغەو حەرامە ؟

ئێستا کاتی ئەوە هاتووە کە بپرسین : تەکفیرکردن مافی کێیە ؟

لە وڵامی ئەم پرسیارەدا دەوترێت : بێگومان هەر یەك لەزاراوەکانی ( **کافر** ) و ( **تەکفیرکردن** ) دوو زاراوە و حوکمی شەرعیین و تەنها و تەنها مافی خوای پەروەردگار و پەیامبەرەکەین ﷺ ، واتە دەبێت تێیاندا بگەڕێینەوە بۆ قورئانی پیرۆز و سوننەتە صەحیحەکانی پەیامبەرمان ﷺ ، بەڵگەی ئەم وتەیەش فەرموودەی ( جُنَادَةَ ) ـی کوڕی ( أَبِي أُمَيَّةَ ) یە ، کە فەرموویەتی : ڕۆشتینە لای ( عُبَادَةَ بْن الصَّامِت رضي الله عنه ) لەکاتێکدا کە نەخۆش بوو ، ئێمەش پێمان وت : خوای پەروەردگار چاکەت بۆ بکات ، فەرموودەیەکمان بۆ بگێڕەوە کە لە پەیامبەری خواوە ﷺ بیستبێتت و خوای پەروەردگار بیکات بە مایەی سودمەندبوونمان ، ئەویش فەرمووی : پەیامبەری خوا ﷺ بانگی کردین ، و ئێمەش بەیعەت و پەیمانمان پێدا ، لەو شتانەش کە بەیعەت و پەیمانی لێوەرگرتین و بەمەرجی گرتن ئەوەبوو : (( أَنْ بَايَعَنَا عَلَى السَّمْعِ وَالطَّاعَةِ فِي مَنْشَطِنَا وَمَكْرَهِنَا ، وَعُسْرِنَا وَيُسْرِنَا ، وَأَثَرَةٍ عَلَيْنَا ، وَأَنْ لَا نُنَازِعَ الْأَمْرَ أَهْلَهُ [ وَفِي رِوَايَةٍ : وَإِنْ أَكَلُوا مَالَكَ ، وَضَرَبُوا ظَهْرَكَ ] ، إِلاَّ أَنْ تَرَوْا كُفْراً بَوَاحاً عِنْدَكُمْ مِنَ اللَّهِ فِيهِ بُرْهَانٌ )) [1] ، واتە : بەیعەتمان پێدا لەسەر گوێبیستبوون و گوێڕایەڵیکردنی کاربەدەستان لەوەی کە پێمان خۆشە و لەوەش کە پێمان ناخۆشە ، لە کاتی دژواری و ناڕەحەتی ، و خۆشگوزەرانی و ئاسانکاریدا ، و لەو کاتەش کە خەڵکانی تر پێشدەخرێن لەسەرمان ، و لەسەر ئەوەش کە هەوڵمان ئەوە نەبێت کە ئەمارەت و دەسەڵاتیان لێبسێنینەوە ، ئەگەرچی ماڵ و سامانمان بخوات و لەپشتیشمان بدات ، ئیللا لەو بار و حاڵەدا نەبێت کە کوفرێکی یەکلای گەورەی بەئاشکرای لێببینرێت ، و بەڵگەیەکی حاشا هەڵنەگرتتان لەسەری هەبێت لە خوای پەروەردگارەوە ـ کە ئەویش : دەقی ئایەتێکی قورئان بێت ، یان فەرموودەیەکی صەحیح ـ .

پێشەوا ( ابْنُ حَزْمٍ الْأَنْدَلُسِيُّ ) ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ فەرموویەتی : (( بێگومان هەموو ئەوانەی کە ئیسلامەتیان جێگیر دەبێت ، ئەوا لێیان وەرناگیرێتەوە و لا نابرێت ئیللا بە دەقێك یان بە کۆدەنگی زانایان نەبێت ، ئەما بە لافلێدان و بوهتان بۆ کردن ئەوە نابێت )) [2] .

---

[1] رواه البخاري ومسلم ، والزيادة في الصحيحة ، برقم : ٣٤١٨ .

[2] ( الفصل في الملل والاهواء والنحل ، لابن حزم الأندلسي : ٣ / ١٣٨ ) .

و پێشەوا ( ابْنُ تَيْمِيَّة ) . رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى . فەرموویەتی : (( بێگومان كوفر حوكمێكی شەرعیە ، تەنها لە خاوەن شەرعەكەوە وەردەگیرێت )) [٥] ، و فەرمووێتی : (( و تەنها بە بەڵگەی شەرعی ئەو كارە جێگیر دەبێت )) [٦] .

هەر لەم بارەیەوە ( ابْنُ الْوَزِيْر ) یش . رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى . فەرموویەتی : (( تەكفیركردن تەنها بە پێی بیستن دەبێت ـ بە پێی بەڵگەكانی قورئان و سوننەت ـ ، و هیچ ڕێكەیەك نییە بۆ دەستێوەردانی ژیری و عەقڵ تێیدا )) [١] .

و شێخ ( السَّعْدِي ) . رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى . فەرموویەتی : (( حوكمدان بە كوفر مافی خوای پەروەردگار و پەیامبەرەكەیەتی ﷺ ، بۆیە هیچ كەسێك كافر نییە جگە لەوانە نەبێت كە خوای پەروەردگار و پەیامبەكەی ﷺ تەكفیریان كردووە ، و بەكافریان زانیوە )) [٣] .

و شێخ ( ابْنُ عُثَيْمِيْنَ ) . رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى . فەرموویەتی : (( پێویستە تەكفیركردن كورتهەڵبێنین لەوەی كە لە قوئان و سوننەتدا هاتووە ، چونكە حوكمدان بە تەكفیر لە كۆی ئەو ئەحكامانەیە كە تونها لە خوای پەروەردگارەوە وەردەگیرێت ، ... بۆیە نابێت و دروست نییە بڵێین : ئەمە كوفر و بێباوەڕیە ، و ئەمە باوەڕە ئیللا بە بەڵگەوە نەبێت ، پاشان ئەگەر وتمان ئەمە كوفر و بێباوەڕیە ئەوا حوكم نەدەین لەسەر هەموو ئەنجامدەرێكی بەوەی كە كافر و بێباوەڕە ، چونكە لەوانەیە عوزر و بەهانەیەكی هەبێت ، یان ڕەوایی لەلا نادیارە و تێكەڵبووە ، یان لەوانەیە ناچاربوبێت و لەبەر زەرورەت ئەمەی ئەنجام دابێت ، هەر بۆیە دەبێت ئارام بگرین و پەلە نەكەین تاكو بار و حاڵی كەسەكەمان لەلا ئاشكرا دەبێت ، جا كەحاڵ و باری كەسەكە ئاشكرابوو ، و زانیمان كەسەكە زانست و عیلمی هەیە ، و جەرائەتی ئەوەی كردووە لە ئەنجامدانی ئەوەی كە دەیگەیەنێتە كوفر ، ئەو كاتە تەكفیری دەكەین )) [٤] .

---

[٥] ( درء تعارض العقل مع النقل ، لابن تيمية : ١ / ٢٤٢ ) .

[٦] ( مجموع الفتاوى ، لابن تيمية : ١٧ / ٧٨ ) .

[١] ( العواصم والقواصم ، لابن الوزير : ٤ / ١٧٨ ) ، و ينظر : ( العواصم والقواصم ، لابن الوزير : ٤ / ١٧٩ )

[٣] ( إرشاد أولي البصائر والألباب لنيل الفقه بأقرب الطرق وأيسر الأسباب ، للسعدي ، ص١٩٨ ) .

[٤] ( لقاء الباب المفتوح : ٦ / ٤٠ ـ ٤١ ، سؤال ٣١٠ ، حكم تكفير رجل معين يعمل أعمالاً كفرية ) .

**بەڵام ئەوەی کە گرنگە لێرەدا بزانرێت ئەوەیە :** کە کێ حوکمی تەکفیر دەدات ؟ و ئایا گەنجان و فێرخوازانی زانستی شەرعی بۆیان هەیە بەم کارە هەستن و تەکفیری کەسێك بکەن کە کەوتبێتە کردارێك یان گوفتارێکی کوفریەوە ؟

**لە وەڵامدا دەوترێت :** بێگوما تەکفیرکردن و دانی حوکمی تیکفیر لەسەر تاکی دیاریکراو و تایبەت تەنها زانایان و ئەهلی عیلم پێی هەڵدەستی ، و متمانە لەسەرکراویش وتەی ئەوانەیانە کە لە بەڵگەکانی قورئان و سوننەتەوە وەریدەگرن ، ناشبێت بە هیچ جۆرێك فیرخوازانی زانستی شەرع پێی هەستن چ جای عەوام و نەخوێندەوارە شەرعیەکان .

پێشەوا ( ابْنُ تَيْمِيَّةَ ) .رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى. فەرموویەتی : (( بێگومان هەستانی نەزان و نەفامەکان بە تەکفیرکردنی زانایانی ئیسلام یەکێکە لە گەورەترینی تاوان و خراپەکاریەکان ، و بنەوای ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ خەواریج و رافیزەکان ئەوانەی کە پێشەوا و کاربەدەستانی موسوڵمانان تەکفیردەکەن ، لەبەر ئەو بیروباوەڕەیان کە بە هەڵەیان دەزانن لە ئاییندا ، ... )) [٤] .

و شێخ ( عَبْدُاللَّطِيْف ) ـی کوڕی ( عَبْدِالرَّحْمَنِ ) .رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى. لە میانەی وتووێژێکیدا کە باس لە بابەتگەلێك دەکات خەڵکانێك دەستیان تێوەرداوە و کاری ئەوان نییە ـ لەوانە : باسکردنی دۆستایەتی و دوژمنایەتی و ئاشتەواییەکان و ... هاوشێوەکانیان لە وتەی هاوەڵبڕیاردەران و گومڕایان ، و حوکم کردن بە جگە لەوەی کە خوای پەروەردگار دایبەزاندووە لەلای خەڵکانی دەشتەکی ـ فەرموویەتی : (( کە هەموو ئەوانەش جگە لە زانای خاوەن هزر نەبێت هیچ کەسێکی تر قسەی تێیدا ناکەن ، لەو زانایانەی کە خوای پەورەردگار تێگەیشتنی چاکی پێکەرەم کردوون ، و حیکمەت و دانایی و جیاکاری وتەکانیان پێدراوە )) [١] .

و شێخ ( عَبْدُاللَّهِ ) ـی کوڕی ( عَبْدالرَّحْمَن ) ، ناسراو بە ( أَبَابْطِيْن ) .رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى. فەرموویەتی : (( ئەوەی کە زانایان ڕاجیاوازن تێیدا کە کوفرە یان نە ، ئیحتیات بۆ ئایین ئەوەیە کە تێیدا بوەستین و ئەنجامی نەدەین ، مادام هیچ دەقێکی ڕاشکاو نییە لە پرس و باسەکەدا لە پەیامبەری خواوە ﷺ ، کەچی شەیتان زۆرینەی خەڵکی بە هەڵەدا بردووە لەم پرس و باسەدا ، دەبینین هەندێك کورتڕەویان کردووە و حوکمی موسوڵمانێتیان داوە لەسەر ئەوانەش کە تەنانەت دەقەکانی قورئان و سوننەت و

---

[٤] ینظر : ( مجموع الفتاوى : ٣٥ / ١٠٠ ) .

[١] ینظر : ( الدرر السنية : ١ / ٤٦٧ ـ ٤٦٩ ) .

كۆڕای زانایان بە كافریان داناوون ، و لەبەرامبەریشدا كۆمەڵانێكی تر زیادڕەویان كردووە و ئەوانەیان تەكفیركردووە كە تەنانەت دەقەكانی قورئان و سوننەت و كۆڕای زانایانیش بە موسوڵمانیان داناوون ، لەوەش كە جێی سەرسوڕمانە : كەسانێك هەن لەوانە ئەگەر پرسیارێكی لێبكرێت لە پرس و باسەكانی تەهارە یان كڕین و فرۆشتن ، و هاوشێوەكانیان ، بە بۆچوونی خۆی و بەباشدانانی عەقڵی فەتوا نادات ، بەڵكو بە دوای وتەی زانایاندا دەگەڕێت ، و فەتوا بەوە دەدات كە ئەوان فەتوایان پێداوە ، ئەی چۆن لە بابەتێكی گەورەی ئاوادا ، كە گەورەترین بابەتەكانی ئایین و ترسناكترینیانە بەتەنها متمانە دەكاتە سەر تێگەیشتن و بەباشدانانی خۆی ؟ ، ئای چەند موصیبەتێكی گەورەیە كە توشی ئیسلام بووە لەم دوو كۆمەڵەوە !! و چ كێشەیەكە كەم دووەوە دەكەوێتەوە !! )) [١] .

و شێخ ( سُلَيْمَاْن ) ـی كوڕی ( سَحْمَاْن ) ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ فەرموویەتی : (( ئەم پرس و باسانەی كە ئاماژەم پێكردن ـ لەوەی كە چۆن مامەڵە دەكرێت لەگەڵ كەسێكدا ڕووكەشی ئیسلام و موسوڵمانێتییە ، و ئەوەش كە ڕووكەشی نە موسوڵمانێتییە و نەش كوفر و بێباوەڕییە ـ هیچ كەسێك قسەیان تێدا ناكات جگە لەو زانایانە نەبێت كە خاوەن هزر و عەقڵێكی تەواوون ، وخوای پەوەردگار تێگەیشتنی چاكی پێكەرەم كردوون ، و حیكمەت و دانایی و جیاكاری وتەكانیان پێدراوە )) [١] .

و شێخ ( الْأَلْبَاْنِيُّ ) ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ فەرموویەتی : (( ئەمڕۆ ـ مێژووە و خۆی دووبارە دەكاتەوە وەك دەڵێن ـ ، گەنجانێكی موسوڵمان هەڵقورتاون ، كە كەمێك نەبێت لە ئایین تێنەگەیشتوون ، و كە دەبینن كاربەدەستان ـ كەمێكیان نەبێت ـ حوكم بەوە ناكەن كە خوای پەروەردگار دایبەزاندووە ، بۆیە لێدەرچوونیان بەباشداناوە لەو كاربەدەستانە ، بەبێ ئەوەی كە ڕاوێژكاری بە خاوەن زانین و تێگەیشتن و داناكانیان بكەن ، بەڵكو سوار كەلەی خۆیان بوون ، ئاشوبێكی كوێرانەیان ناوەتەوە ، خوێنیان ڕشتووە لە میسر و سوریا و جەزائیر ، و پێشتریش لە ئاشوبەكەی ناو حەرەمی مەككەدا ، بەوەش پێچەوانە بوونەوە لەگەڵ ئەم فەرموودەیەدا ـ مەبەسی فەرمودەكەی ( عُبَادَةُ بْنُ الصَّامِت ) ـە ـ كە كار و كردەوەی موسوڵمانانی ـ پێشین و پاشینی ـ لەسەر بووە جگە لە خەواریجەكان نەبێت )) [٢] .

---

[١] ینظر : ( الدرر السنية : ١٠/ ٣٧٤ ، ٣٧٥ ) .

[١] ( الدرر السنية : ١٠/ ٤٦٨ ـ ٤٦٩ ) .

[٢] ( موسوعة الألباني في العقيدة : ٤ / ٢٩٥ ) .

## میانڕەویّتی ئەهلی سوننە و جەماعە لە تەکفیردا و تاوانی تەکفیرکردن و ئەو هەڕەشانەی کە لەو بارەیەوە هاتوون :

حاڵ و باری ئەهلی سوننە و جەماعە لە نێو کۆمەڵ و گروپە گومڕاکاندا نێوەندگر و میانڕەون لە نێو کۆمەڵ و گروپە گومڕاکاندا لە پرس و باسی تەکفیر بەتایبەت و لە هەموو پرس و باسەکانی تردا، خوای پەروەردگار فەرموویەتی : ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُواْ شُهَدَاء عَلَى النَّاسِ وَيَكُونَ الرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا ﴾ [ البقرة : ١٤٣ ] ، واتە : و هەروەها ئێمە ئێوەمان بە گەلێکی میانڕەو گێڕاوە ـ لە هەموو ڕوویەکەوە لە ڕووی عیبادەت و خواپەرستیتاندا ، لە ڕووی دونیا و دوارۆژتاندا ، لە ڕووی داخوازییەکانی ڕووح و نەفسەوە ... هتد ـ تا ببنە شایەت بەسەر خەڵکیەوە ـ تا بزانن ئەم ئایینە هەموو مایەی خێر و سەربەرزیە بۆ تاك و کۆمەڵگا لە هەموو سەردەمێکدا و لە هەموو بوارەکانی ژیاندا ـ و بۆ ئەوەی پەیامبەریش ﷺ لە هەموو ئەو بوارانەدا مامۆستا و ڕابەری ئێوە بێت و لە ڕۆژی قیامەتدا شایەتی بدات بۆ دڵسۆزانی ئوممەتی لەسەر ئەوەی بە ئەرکی سەرشانی خۆیان هەستاون .

بۆیە ئەوانەی زیادڕەوی دەکەن لە تەکفیرکردنی موسوڵمانانێکدا کە شایستەی ئەو حوکمە نین و لەو نێوەندگیری و میانڕەوێتیە لادەدەن تاوانێکی گەورەیان ئەنجام داوە ، و تاوانەکەشیان وەکو کوشتنی موسوڵمانێکی بێ تاوانە کە شایستەی کوشتن نەبێت ، بەڵگەی ئەمەش ئەو وتەیەی پەیامبەری خوایە ﷺ کە تێیدا تەکفیرکردنی موسوڵمانی شوبهاندوە بە کوشتنی ـ ئاشکراشە کە کوشتنی موسوڵمانی بێ تاوان تاوانێکی گەورەیە ـ ، هەروەك فەرموویەتی : (( ... ، وَلَعْنُ الْمُؤْمِنِ كَقَتْلِهِ ، وَمَنْ رَمَى [ أَوْ : قَذَفَ ] مُؤْمِناً بِكُفْرٍ فَهُوَ كَقَتْلِهِ )) [١] ، واتە : حەرامێتی و تاوانی نەفرین و لەعنەتکردن لە باوەڕدار وەکو حەرامێتی و تاوانی کوشتنێتی ، و هەر کەسێکیش تەکفیری باوەڕدارێك بکات ، ئەوە تاوانەکەی لەلای خوای پەروەردگار وەکو تاوانی کوشتنێتی .

ئەمەش هەڕەشەیەکی گەورەیە لەو کەسەی کە موسوڵمانێکی بێ تاوان تەکفیردەکات کە شایستەی تەکفیرکردن نییە ، و کارەکەشی بە تاوانی گەورە لەسەر دەنوسرێت ، ئەوەش لەبەر ئەو شوبهاندنەی کە پەیامبەری خوا ﷺ شوبهانویەتی بە تاوانی کوشتنی موسوڵمانی بێتاوان .

سەباری ئەو هەڕەشە گەورەیەی سەرەوە لە سوننەتدا چەندها فەرموودەی تر هاتوون کە هەموو هەڕەشەیەکی توندن لە بارەی تەکفیرکردنی موسوڵمانی شایستە نەبوو بە تەکفیرکردن ، لەوانەش :

---

[١] رواه البخاري ومسلم واللفظ للبخاري ، والزيادة في صحيح وضعيف سنن الترمذي ، برقم : ٢٦٣٦ .

فەرموودەی ( عَبْدِاللَّـه ) ــی کوڕی ( عُمَرَ ) . رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَاْ . دەگێڕێتەوە کە پەیامبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (( أَيُّمَاْ رَجُلٍ قَاْلَ لأَخِيْهِ : يَاْ كَاْفِرُ ! فَقَدْ بَاْءَ بِـهَاْ أَحَدُهُمَاْ ، [ فَإِنْ كَاْنَ كَمَاْ قَاْلَ ، وَإِلاَّ رَجَعَتْ عَلَيْهِ ] )) [١] ، واتە : هەر کەسێك بە براکەی بڵێت : ئەی کافری بێباوەڕ !! ئەوا یەکێکیان ئەو حوکمە دەیگرێتەوە ، جا ئەگەر بەرامبەرەکەی کافر بوو ئەوە هیچ ، ئەگەرنە ئەوە تەکفیرکردنەکە بۆ خۆی دەگەڕێتەوە .

و لە فەرموودەی ( أَبو سَعِيْد ) ــدا ﷺ هاتووە کە پەیامبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (( مَاْ أَكْفَرَ رَجُلٌ رَجُلاً ؛ إِلاَّ بَاْءَ أَحَدُهُمَاْ بِـهَاْ : إِنْ كَاْنَ كَاْفِراً ، وَإِلاَّ كَفَرَ بِتَكْفِيْرِهِ )) [٣] ، واتە : هیچ کەسێك نیە کە تەکفیری کەسێکی تر بکات ، ئیللا دەبێت ئەو حوکمە یەکێکیان بگرێتەوە ، جا ئەگەر بەرامبەرەکەی کافر بوو ئەوە هیچ ، ئەگەرنە ئەوا خۆی بەو تەکفیرکردنە کافر دەبێت .

بۆیە ئەگەر تاوانی ئەو کارە هەڵبگرێت کەسی تەکفیرکار یان خۆی پێی کافر بێت ، ئەوا بەڕاستی هەڕەشەی توندن ـ خوا پەنامان بدات لە لێیان ـ ، بۆیە دەبێت موسوڵمانی پەرۆشی دوارۆژی خۆی دووربکەوێتەوە لەو تاوانە گەورەیە [١] .

پێشەوا ( الشَّوْكَاْنِي ) . رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَاْلَى . فەرموویەتی : (( لەم فەرموودانە و هاوشێوەکانی گەورەترین ڕاچەڵەکێنەر ، و ئامۆژگاری تێدایە بۆ ئەوانەی کە پەلەدەکەن لە تەکفیرکردندا ... )) [٢] .

و پێشەوا ( ابْنُ حَجَر ) یش . رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَاْلَى . فەرموویەتی : سەرباری ئەوەی کە ترسێنەری موسوڵمانن لە تەکفیرکردنی برا موسوڵمانەکەی ، ترسی ئەوەشی هەیە کە ئاکامی کارەکەی بۆ بێباوەڕی و کافربوونی خۆی بڕوات ، چونکە تاوان نامەبەر و گەیەنەرە بە بێباوەڕی و کوفر ، و سوربوون لەسەر تاوان عاقیبەت خراپی لێدەکەوێتەوە [٤] .

---

[١] رواه البخاري ومسلم ، والزيادة عند مسلم .

[٣] الصحيحة ، برقم : ٢٨٩١ ، وصحيح الجامع ، برقم : ٥٥٤٥ .

[١] بڕوانە : هەر یەك لە : [ الاستذكار : ٨ / ٥٤٨ ـ ٥٤٩ ] ، و [ التمهيد ، لابن عبدالبر : ١٧ / ٢٢ ] . .

[٢] ( السيل الجرار ، للشوكاني : ٤ / ٥٧٨ ) .

[٤] بڕوانة : ( فتح الباري ، لابن حجر : ١٠/ ٤٤٦ ) .

و پێشەوا ( ابْنُ دَقِيْق ) . رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى. سەرباری ئەوەی کە فەرموودەکان بە هەڕەشەیەکی توندیان دەزانێت بۆ ئەو کەسانەی کە یەکێك لە موسوڵمانان تەکفیر دەکات ، بە گیرۆدەبوونێکی گەورەی دەزانێت کە هەندێك لە شوێنکەوتوانی سوننە و ئەهلی حەدیسی تێوەگلاوە ، لەبەر ئەو جیاوازیەی کە هەیانە لە بیروباوەڕدا ، بۆیە دەبینیت حوکمی توند لەسەر بەرهەڵستکارانیان دەدەن و تەکفیریان دەکەن [٢] .

هەر لەم بارەیەوە شێخ ( مُحَمَّدُ بْنُ صَالِحٍ الْعُثَيْمِيْن ) . رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى. فەرموویەتی : نابێت کەمتەرخەمی بکرێت لە تەکفیرکردنی موسوڵماندا ، چونکە ئەو کارە دوو حەرام و قەدەغەکراوی تێدایە : **یەکێکیان :** درۆکردنە بە ناو خوای پەروەردگارەوە لە حوکمدانی لەسەر بەرامبەرەکەی ، وەك چۆن شتێك حەڵاڵ بکەیت کە خوای پەروەردگار حەرامی کردبێت ، و **دووەمیشیان :** وەسفرکردن و ناوزەدکردنی موسوڵمانێکە بە کوفر و بێباوەڕی ، کەچی بێبەری و بێتاوانە لەو کارە ، بۆیە نزیکە بگەڕێتەوە بۆ خۆی ، هەروەکو لە فەرموودە صەحیحەکاندا هاتووە .

ئەمەی دووەمیشیان حەرام و قەدەغەکراوێکی زۆر گەورەیە نزیکە ڕووبدات ، چونکە زۆرینەی ئەو کارە زیادڕەویکردنە ، و بەبێنرخ و بەکەمدانانی بەرامبەرەکەیەتی ، و لەخۆباییبوونی و کیبری تێدایە ، کە لەوانەیە کردەوەکانی پوچەڵ بکاتەوە ، و هۆکاری چوونە ئاگری دۆزەخی بێت [١] .

---

[٢] بڕوانە : ( إحكام الأحكام شرح عمدة الأحكام ، لابن دقيق العيد : ٢ / ٢١٠ ) .

[١] ينظر : ( مجموع فتاوى ، لابن تيمية : ٢ / ١٣٣ ـ ١٣٤ ) .

## زیادڕەویکردن لە تەکفیر لە مێژوودا :
## [ گروپ و هەڵگران و سەرهەڵدان و گرنگترین بیروباوەڕیان ]

زیادڕەوی کردن لە تەکفیرکردنی کەسانی موسوڵمانی ناشایستەی بە تەکفیر کار وکردەوە و سیفەتی کۆمەڵ و گروپی گومڕای خەواریجە حەروریەکان بووە لە مێژووی ئیسلامدا ، سەری ئەم کۆمەڵ و گروپە گومرایە و سیفەتی شوێنکەوتوانی لە فەرموودەی ( أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ) ﷺ ئاماژەی پێدراوە ، کە دەگێڕێتەوە : ( عَلِي ﷺ ) لە یەمەن دەبێت و بڕێك ماڵ و سامان بۆ پەیامبەری خوا ﷺ دەنێرێتەوە و ئەویش بە پێی حیکمەت و دانای خۆی لە نێوان چەند کەسێکدا ـ و بۆ دڵڕاگیرکردنیان لەسەر ئیسلام ـ دابەشی دەکات ، کەچی ئەم کارەی پێغەمبەری خوا ﷺ جێی ڕازیبوونی هەندێك نابێت !! و پیاوێك بە ناوی ( ذُو الْخُوَيْصِرَة ) دێت و دەڵێت : ئەی موحەممەد تەقوای خوات هەبێت و دادپەروەربە !!! پاشان کە دەڕوات پەیامبەری خوا ﷺ سەبارەت بەخۆی و شوێنکەوتوانی دەفەرموێت : (( إِنَّ مِنْ ضِئْضِئِ هَذَا قَوْماً ، [ أو : أَصْحَاباً يَحْقِرُ أَحَدُكُمْ صَلَاتَهُ مَعَ صَلَاتِهِمْ ، وَصِيَامَهُ مَعَ صِيَامِهِمْ ] ، يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ ، لَا يُجَاوِزُ حَنَاجِرَهُمْ ، [ أَوْ : تَرَاقِيَهُمْ ] ، يَقْتُلُونَ أَهْلَ الْإِسْلَامِ ، وَيَدَعُونَ أَهْلَ الْأَوْثَانِ ، يَمْرُقُونَ مِنَ الْإِسْلَامِ كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ ، لَئِنْ أَدْرَكْتُهُمْ لَأَقْتُلَنَّهُمْ قَتْلَ عَادٍ )) [٢] ، واتە : بێگومان لە پشتینەی ئەمە و شوێنکەوتوو و هاوەڵانی خەڵکانێك یان هاوەڵانێك دەبن یەکێك لە ئێوە لە بەراوردکردنی نوێژەکەی بە نوێژی ئەوان ڕقی لە نوێژەکەی خۆی دەبێتەوە ، و ڕقی لە ڕۆژووەکەشی دەبێتەوە لەبەراوردی بە ڕۆژووەکەی ئەوان ، قورئان دەخوێنن بەڵام لە قورقوڕاگە یان لە ئاستی ملیان تێناپەڕێت و بەرز نابێتەوە ، موسوڵمانان دەکوژن ـ چونکە بەکافریان دەزانن ـ ، و واز لە بتپەرستان دەهێنن ـ تێکۆشان و جیهادیان دژ ناکەن ـ ، و لە ئیسلام دەردەچن ، هەروەکو چۆن تیر لە نێچیر دەردەچێت ، ئەگەر پێیان بگەم ئەوا لە ناویان دەبەم و ڕیشەکێشیان دەکەم وەك لەناودان و ڕیشەکێش کردنی قەومی عاد .

لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە ڕاوی دەڵێت : عەلی ﷺ فەرموویەتی : بیستومە لە پەیامبەری خواوە ﷺ فەرموویەتی : (( تَخْرُجُ خَارِجَةٌ مِنْ أُمَّتِي ، [ حُدَثَاءُ الْأَسْنَانِ ، سُفَهَاءُ الْأَحْلَامِ ، يَقُولُونَ مِنْ خَيْرِ قَوْلِ الْبَرِيَّةِ ] ... ، مِنْ أَبْغَضِ خَلْقِ اللَّهِ إِلَيْهِ [ فَأَيْنَمَا لَقِيتُمُوهُمْ فَاقْتُلُوهُمْ ] ؛ [ فَإِنَّ فِي قَتْلِهِمْ أَجْراً

---

[٢] رواه مسلم ، وما بين المعقوفات عنده ـ أيضا ـ ، برقم : ١٤٨ ـ ( ١٠٦٤ ) .

عَظِيماً عِنْدَ اللَّـهِ لِـمَنْ قَتَلَهُـمْ ] ، ... )) [١] ، واتە : کۆمەڵانێك لە ئومەتەکەم دەردەچێت ، کەم تەمەن و گەنجن ، کاڵفام و کەم عەقڵن ، وتە و گوفتاریان لەباشترینی گوفتار و وتەی خەڵکە ـ هەندێك دەڵێن : مەبەست پێی قورئانە ، هەندێکی تر وتویانە : مەبەست پێی : سوننەتی پەیامبەری خوایە ﷺ ـ ، لە ڕقلێبوترینی دروستکراوەکانی خوای پەروەردگارن لە لای ئەو ، لە هەر کوێیەك پێیان گەیشتن بیانکوژن ، چونکە پاداشتێکی گەورە لە کوشتنیاندا هەیە بۆ ئەو کەسەی کە دەیانکوژێت .

ناوی ئەم کۆمەڵ و گروپە گومڕایەش کە پەیامبەری خوا ﷺ باسیکردوون **خەواریجە** ، جا با بزانین واتای ناوەکەیان لە زمانەوانی و زاراوەی زانایاندا چییە ؟ ، و کەی سەریان هەڵداوە ؟ ، و ئاشکرا ترین بنەوای بیروباوەڕیان چییە ؟

( الْـخَوَاْرِج ) : **لە زمانەوانیدا** ناوێکی کۆیە و تاکەکەی ( خَاْرِجَة ) یە ، و بە واتای : کۆمەڵە دەرچوویەك دێت ، و نیسبەت بۆ لای ( خَاْرِجِيّ ) ، بە ( خَاْرِجِيُّونَ ) یش کۆ دەکرێتەوە . بەڵام **لە زاراوەی زانایاندا** ( الْـخَوَاْرِج ) : بەو کۆمەڵە بیدعەکار و گومڕایە دەوترێت کە بەو ناوە ناونراون ، لەبەر دەرچوونیـان لە کۆمەڵی موسوڵمانان ، وپێشـەواکەیان لە سەردەمی خەلافەتی ( عَلِـي ) کوڕی ( أَبو طَاْلِب ) رضي الله عنه لە دەرئەنجامی هەندێك فیتنە و ئاشووب کە لە نێوان هاوەڵاندا کەوتەوە ، بۆیە لێی درچوون و خۆیان لێبەریکرد و تەکفیریانکرد ، بەڵکو هەموو هاوەڵانیان تەکفیرکرد.

بەڵام ئێستا ئەم ناوە : هەموو ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە لە پێشەوایان و کاربەدەستانی موسوڵمانان دەردەچن ، و هاوڕای ئەوانەن لە بۆچوونەکانیان ، و بنەواکانی ئەوان وەردەگرن ، و ڕێچکە و ڕێبازی ئەوان دەگرنەبەر لە هەموو سەردەمێکدا ، و لەم سەردەمەشدا .

**سەبارەت بە سەرهەڵدانیان بۆچوونی جیاواز هەیە :**

**وتراوە :** دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی پەیامبەری خوا ﷺ ، و یەکەمەکەشیان ( ذُو الْـخُوَيْصِـرَة التِّمِيْمِـي ) بووە ، کە ڕەخنەی لەپەیامبەری خوا ﷺ گرتووە لە دابەشکردنی ئەو ماڵ و سامانەی کە عەلی رضي الله عنه لە یەمەنەوە ناردبوویەوە .

**و وتراوە :** لە سەردەمی خەلافەتی ( عُثْمَـاْن رضي الله عنه ) سەریان هەڵداوە ، و فیتنە و ئاشوبیان بۆ ناوەتەوە و لێیدەرچوون و هۆکاری شەهیدکردنی بوون .

---

[١] رواه مسلم ، أما الزيادات فكلها عند البخاري .

**هەروەها وتراوە :** لە پاش ڕێکەوتنی نێوان ( عَلِي ) ، و ( مُعَاوِيَة ) . رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا . لە ساڵی سی و حەوت سەریان هەڵداوە و دەرچوونە لە ( عَلِي ﷺ ) و حوکمی کوفریان بەسەردا داوە [١] .

**ئاشکرا ترین بنەوای بیروباوەڕیان : یەکەم :** بە تاوان موسوڵمان تەکفیردەکەن ، وخوێن وماڵیان حەڵاڵدەکەن ، وحوکمی بەهەتا هەتایی مانەوەیان لە دۆزەخدا بەرسەردا ـ واتە : بە سەر تاوانباراندا ـ دەدەن !! **دووەم :** دەردەچن لە پێشەوا و کاربەدەستی موسوڵمانان ، و کۆمەڵەکەیان .

ئەو سیفەتانەی خەواریج کە لە سوننەتی پەیامبەری خوادا ﷺ هاتوون ، ئەمانەی خوارەوەن :

**یەکەم : کەم تەمەن و گەنج [ حُدَثَاءُ الأَسْنَانِ ] :**

**دووەم : کاڵفام و کەم عەقڵ [ سُفَهَاءُ الأَحْلام ] :**

پەیامبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (( تَـخْرُجُ خَارِجَةٌ مِنْ أُمَّتِي ، حُدَثَاءُ الْأَسْنَانِ ، سُفَهَاءُ الْأَحْلَامِ )) ، واتە : کۆمەڵانێك لە ئوممەتەکەم دەردەچێت ، کەم تەمەن و گەنجن ، کاڵفام و کەم عەقڵن .

**سێیەم : خراپترینی خەڵك و دروستکراوەکانن [ شَرُّ الْخَلْقِ وَالْخَلِيقَةِ ] :**

پەیامبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (( قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ : « هُمْ شَرُّ الْخَلْقِ وَالْخَلِيقَةِ » )) [١] ، پێشەوا ( ابْنُ حَجَر ) . رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى . فەرموویەتی : (( بێگومان خەواریج خراپترینی گروپە داهێنراوەکانن لە ئوممەتەکەی موحەممەد )) [٢] .

**چوارەم : خەڵکانی لەخۆباییبوون [ تُعْجِبُهُمْ نُفُوسُهُمْ ] :**

پەیامبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (( إِنَّ فِيكُمْ قَوْماً يَعْبُدُونَ وَيَدْأَبُونَ ، حَتَّى يُعْجَبَ بِهِمُ النَّاسُ ، وَتُعْجِبَهُمْ نُفُوسُهُمْ ، يَمْرُقُونَ مِنَ الدِّينِ مُرُوقَ السَّهْمِ مِنَ الرَّمِيَّةِ )) [٣] ، واتە : خەڵکانێکتان لێدەردەکەوێت خواپەرستی دەکەن و کۆشش دەکەن ، بە شێوەیەك خەڵك پێیان سەرسام دەبێت ، و

---

[١] ينظر : ( الملل والنحل ، للشهرستاني : ١ / ١١٤ ) ، و ( مقالات الإسلاميين : ١ / ٢٠٧ ) ، و ( الفصل ، لابن حزم : ٢ / ١١٣ ) ، و ( فتح الباري ، لابن حجر : ١٢/ ١٨٣ ) ، و ( روضة الطالبين ، للنووي : ١٠ / ٥١ ) ، و ( نيل الأوطار : ١١ / ٣٦٧ ، وما بعدها ) ، و ( لمحة عن الفرق الضالة ، للفوزان ، ص ٢٤ ـ ٢٦ ) .

[١] ( رواه مسلم ، برقم : ١٥٨ ـ ( ١٠٦٧ ) .

[٢] ( فتح الباري ، لابن حجر : ١٢ / ٣٠٢ ) .

[٣] ( رواه أحمد ، برقم : ١٢٨٨٦ ، وقال الأرناؤوط : إسناده صحيح على شرط الشيخين ) .

خۆشیان بە خۆیان سەرسام دەبن و لەخۆبایی دەبن ، بەڵام لە ئایین دەردەچن هەروەکو چۆن تیر لە نێچیر دەردەچێت .

## پێنجەم : هەڵە تێگەیشتنیان بۆ قورئان هەیە [ يُسِيْؤُونَ فَهْمَ الْقُرْآنِ ] :

پەیامبەری خوا ﷺ سەبارەتیان فەرموویەتی : (( يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ يَحْسِبُونَ أَنَّهُ لَهُمْ وَهُوَ عَلَيْهِمْ )) [٢] ، واتە : قورئان دەخوێننەوە وادەزانن بەڵگەیە بۆیان کەچی بەڵگەیە لەسەر خۆیان .

پێشەوا ( ابْنُ تَيْمِيَّة ) . رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى . فەرموویەتی : (( بیدعە و داهێنراوە سەرەتاییەکان ـ وەکو بیدعەی خەواریج ـ تەنها لە هەڵە تێگەیشتنیان لە قورئانەوە هاتووە ، خۆ ئەوان نەیانویستوە پێچەوانەی قورئان ببنەوە ، بەڵام ئەوەی لێتێگەیشتوون کە بەڵگە نەبووە بۆی )) [٥] .

و پێشەوا ( ابْنُ حَجَر ) . رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى . فەرموویەتی : (( ئەوان ـ واتە : خەوریجەکان ـ ڕاڤەی قورئانیان دەکرد بە پێچەوانەی مەبەستەکەی )) [٦] .

## شەشەم : قسەزل و کردەوە پوچن [ يُحْسِنُونَ الْقِيْلَ ، وَيُسِيئُونَ الْفِعْلَ ] :

پەیامبەری خوا ﷺ سەبارەتیان فەرموویەتی : (( يُحْسِنُونَ الْقِيْلَ ، وَيُسِيئُونَ الْفِعْلَ )) [١] ، چونکە : (( يَقُولُونَ مِنْ خَيْرِ قَوْلِ الْبَرِيَّةِ )) [١] ، وەك ئەوەی پێشەوا ( النَّوَوِي ) . رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى . فەرموویەتی : (( تەنها لە ڕووکەشدا ، وەك ئەوەی کە دەڵێن : (( إِنِ الْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ )) ، و هاوشێوەکانی ، و بانگەشە کردنیان بۆ قورئانی پیرۆز )) [١] .

---

[٢] رواه مسلم .

[٥] ( مجموع الفتاوى ، لابن تيمية : ١٣ / ٣٠ ) .

[٦] ( فتح الباري ، لابن حجر : ٩ / ٤٨ ) .

[١] [ صحيح سنن أبي داود ، برقم : ٤٧٦٥ ] .

[١] [ ] .

[١] ( حاشية السندي على سنن النسائي : ٧ / ١١٩ـ١٢٠ ) .

**حەوتەم : ئەهلی ئیسلام تەكفیر دەكەن [ يَقْتُلُونَ أَهْلَ الإِسْلاَمِ ] :**

پەیامبەری خوا ﷺ سەبارەتیان فەرموویەتی : (( يَقْتُلُونَ أَهْلَ الإِسْلاَمِ ، وَيَدَعُونَ أَهْلَ الأَوْثَانِ )) [٢] ، هۆكاری كوشتنیشیان بۆ موسوڵمان بەكافردانانیانە ، پێشەوا ( الْقُرْطُبِي ) . رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى . فەرموویەتی : (( خەواریجەكان كە حوكمی كوفریان دا بەسەر موسوڵماناندا لێیان دەرچوون و خوێنیان حەڵاڵكردن ، ... )) [٣] .

و پێشەوا ( ابْنُ تَيْمِيَّة ) . رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى . فەرروویەتی : (( خەواریج یەكەم گروپ بوون كە موسوڵمانایان بەتاوان تەكفیركرد ، و ئەوەش پێچەوانەیان بێتەوە لە بیدعەكەیاندا بەكافری دەزانن ، و خوێن و ماڵی حەڵاڵ دەكەن )) [٤] .

**خاڵێكی گرنگ لێرەدا دێتە پێشەوە و پێویستە بزانرێت ئەوەیش :** ئەوەیە كە یەكێك لە بنەواكانی ئەهلی سوننە و جەماعە ئەوەیە كە : تەكفیركردن لە ڕووی گشتیێتی [ التَّكْفِيْرُ الْـمُطْلَقُ ] و تایبەتكردنەوە [ التَّكْفِيْرُ الْـمُعَيَّنُ ] جیاوازن و دەبێت مامەڵەی جیاوازیان لەگەڵدا بكەین ، چونكە لەوانەیە تاكی موسوڵمان بكەوێتە گوفتار یان كردارێك كە بەڵگەی ئەوەی لەسەر بێت كە ئەو گوفتارە یان ئەو كردارە كوفرە ، بەڵكو لەوانەیە كۆڕای زانایانی لەسەر بێت كە كوفرە ، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت كە ئەگەر گوفتارەكە یان كردارەكە كوفر بێت ، ئەوا هەموو تاكێكی تایبەت و دیاریكراو كە ئەو گوفتارە یان ئەو كردارەی ئەنجام داوە پێی كافر ببێت ، چونكە مەرج نیە هەر كەسێك كەوتە كوفرەوە حوكمی كوفری بەسەردا بدرێت ، لەبەر ئەوەی كە تەكفیركردنی تاكی تایبەت و دیاریكراو چەندەها مەرج و چەندەها ڕێگر هەیە لە پێش تەكفیركردنیدا ، بۆیە گرنگە ئەم دوو جۆرەی تەكفیركردن و وتەی زانایان لەبارەیانەوە بزانین ، جا بە پشتیوانی خوای پەروەردگار دەڵێم :

تەكفیركردن لە ڕووی گشتیێتی [ التَّكْفِيْرُ الْـمُطْلَقُ ] و تایبەتكردنەوە [ التَّكْفِيْرُ الْـمُعَيَّنُ ] لە وتەی پێشەوایان و زانایانی ئیسلامدا بەم شێوەی خوارەوە باسی لێوەكراوە :

---

[٢] ( متفق عليه ) .

[٣] ( المفهم لـما أشكل من تلخيص كتاب مسلم ، لابن عبدالبر : ٤ / ١٣٩ ) .

[٤] ( مجموع الفتاوى ، لابن تيمية : ٣ / ٢٧٩ ) .

**یەکەم : تەکفیرکردنی گشتێتی** [ التَّكْفِيْرُ الْـمُطْلَقُ ] **:** بریتیە لە حوکمدان بە سەر گوفتارێك یان کردارێك یان بیروباوەڕێك بەوەی کە کوفرە ، و پێچەوانەبوونەوەیە لەگەڵ بنەواکانی ئیسلام و بەتاڵکەرەوەیەیەتی ، و بەسەر ئەنجامدەرەکەشی بە شێوەیەکی گشتی و ڕەهادا دەدرێت ، بە بێ دیاریکردنی کەسێك بەتایبەت دیاریکراوی .

**دووەم : تەکفیرکردنی تایبەت** [ التَّكْفِيْرُ الْـمُعَيَّنُ ] **:** ئەمەیان بریتیە لە حوکمدان لەسەر کەسێکی تایبەت و دیاریکراو بە کوفر ، و دابەزاندنی ئەو حوکمە لەسەری ، لەبەر ئەوەی بەتاڵکەرەوەیەکی لە بەتاڵکەرەوەکانی ئیسلامی ئەنجامداوە ، و هەموو ئەو مەرجانەی تێدایە بۆ تەکفیر کردنی ، و هیچ ڕێگریەکیش نیە لە پێش تەکفیرکردنیدا .

بەڵگەی ئەم دابەشکردن و جیاکاریەش ئەو فەرموودەیەیە کە ( عُمَر ) ـی کوڕی ( الـخَطَّابِ ) ﷺ دەیگێڕێتەوە و تێیدا هاتووە : (( أَنَّ رَجُلاً عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ ﷺ كَانَ اسْمُهُ عَبْدَ اللَّـهِ ، وَكَانَ يُلَقَّبُ حِمَاراً ، وَكَانَ يُضْحِكُ رَسُولَ اللَّـهِ ﷺ ، وَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ قَدْ جَلَدَهُ فِي الشَّرَابِ ، فَأُتِيَ بِهِ يَوْماً فَأَمَرَ بِهِ فَجُلِدَ ، فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ القَوْمِ : اللَّهُمَّ العَنْهُ ، مَا أَكْثَرَ مَا يُؤْتَى بِهِ ؟ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ : « لاَ تَلْعَنُوهُ ، فَوَاللَّـهِ مَا عَلِمْتُ إِلَّا إِنَّهُ يُحِبُّ اللَّـهَ وَرَسُولَهُ » ))[1] ، واتە : کەسێك هەبوو لەسەردەمی پەیامبەری خوادا ﷺ ناوی ( عبداللَّـه ) بوو نازناوی ( حمار ) ـی هەبوو ، پەیامبەری خوای ﷺ دەکردە پێکەنینەوە ، بەڵام ئەم کەسە لەبەر مەیخواردنەوەی پەیامبەری خوا ﷺ جەڵدەی لێدابوو ، ڕۆژێکیان هێنایان بۆ لای پەیامبەری خوا ﷺ ئەویش فەرمانی کرد بە جەڵدە لێدانی ، کەسێك لەو خەڵکەی کە لەوێ بوون نەفرەتی لێکردوو و وتی : خوایا نەفرەت و لەعنەتی لێبکە ، چەندە زۆر دەیهێنن ، پەیامبەری خواش ﷺ فەرمووی : نەفرەت و لەعنەتی لێمەکەن ، چونکە سوێند بێت بە خوا ئەو من دەزانم خوای پەروەردگار و پەیامبەرەکەی خۆش دەوێت .

ئەمە لە کاتێکدایە کە لە فەرموودەی ( أَنَس ) ـی کوڕی ( مَالِك ) ـدا ﷺ هاتووە : (( لَعَنَ رَسُولُ اللَّـهِ ﷺ فِي الْـخَمْرِ عَشَرَةً : عَاصِرَهَا ، وَمُعْتَصِرَهَا ، وَشَارِبَهَا ، وَحَامِلَهَا ، وَالْـمَحْمُولَةُ إِلَيْهِ ، وَسَاقِيَهَا ، وَبَائِعَهَا ، وَآكِلَ ثَمَنِهَا ، وَالـمُشْتَرِي لَـهَا ، وَالـمُشْتَرَاةُ لَهُ ))[2] ، واتە : پەیامبەری خوا ﷺ

---

[1] ( رواه البخاري ، برقم : ٦٧٨٠ ) .

[2] صحيح سنن أبي داود ، برقم : ٣١٢١ .

لە باسی مەیدا نەفرین و لەعنەتی لە دە کەس کردووە : ئەوەی کە دەیگوشێت ، و ئەوەی داوای گوشینی دەکات ، و ئەوەی کە دەیخواتەوە ، و ئەوەشی کە هەڵیدەگرێت و دەیگوێزێتەوە ، و ئەوەی بۆی هەڵدەگرن ، و ئەوەش تێیدەکات بۆ ئەوانەی کە دەیخۆنەوە ، و ئەوەش کە دەیفرۆشێت ، و ئەوەش کە پارەکەی دەخوات ، ئەوەش بۆی دەکردرێت ، و ئەوەش بۆ دەکردرێت .

کەچی سەرباری ئەم نەفرینکردنە گشتییەی پەیامبەری خواش ﷺ لەو هەموو خەڵکانەی کە لەم فەرموودەیەدا دەبینین ، پەیامبەری خوا ﷺ لە فەرموودەی یەکەمدا رێگری دەکات لە نەفرینی تایبەت بۆ ئەو کەسەی کە مەیەکەی خواردبووەوە .

بۆیە پێشەوا ( ابْنُ تَيْمِيَّة ) ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ پاش باسکردنی ئەم دوو فەرموودەیە بنەوایەکمان فێردەکات پوختەکەی ئەوەیە کە : تەکفیری گشتی و رەها [ التَّكْفِيرُ الْـمُطْلَقُ ] خوازیاری تەکفیری تایبەت ودیاریکراو [ التَّكْفِيرُ الْـمُعَيَّنِ ] نییە هەموو جارێك ، چونکە لەوانەیە کەسی تایبەت ودیاریکراو مەرجێك لە مەرجەکانی تەکفیری تێیدا نەبێت ، یان رێگرێك لە رێگرەکانی تەکفیرکردن لە پێش تەکفیرکردنیدا هەبێت ، بۆیە پێویستە رەچاوی جیاوازی بکرێت لە نێوان تەکفیری گشتی ورەها [ التَّكْفِيرُ الْـمُطْلَقُ ] ، لەگەڵ تەکفیری تایبەت ودیاریکراو [ التَّكْفِيرُ الْـمُعَيَّنِ ] ـدا [1] .

شێخ ( مُـحَمَّدُ بْنُ عَبْدِالْوَهَّابِ ) ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ فەرموویەتی : (( پرس و باسی تەکفیرکردنی تایبەت و دیاریکراو پرس و باسێکی زانراوە ، ئەگەر گوفتارێك بڵێت گوفتارەکەی خۆی لە خۆیدا کوفرە ، بۆیە دەوترێت : هەر کەسێك وابڵێت ئەوە کوفری کردووە ، بەڵام ئەگەر کەسی تایبەت و دیاریکراو ئەوەی وت ، ئەوا حوکمی کوفری بەسەردا نادرێت تاکو ئیقامە حوججە لەسەر نەکرێت بەشێوەیەك کە ئەگەر کەسێك وازی لێهێنا پێی کافر ببێت )) [2] .

**بنەوایەکی تر کە پێویستە لەم پرس و باسەدا بخرێتە ڕوو ئەوەیش :** تەکفیرکردن بە گومان و دوو دڵی نابێت لەو گوفتار و کردارانەی کە نییەت کاریگەری تیایاندا هەبێت ، چونکە مەرج نییە هەر موسوڵمانێك کەوتە کوفر و هاوەڵبڕیاردانەوە ، ڕاستەوخۆ بێباوەڕ ببێت و لە ئایین دەربچێت ، بەڵگەی ئەم بنەوایە فەرموودەکەی ( عَلِي بْن أَبِي طَالِب ) ـە ﷺ کە سەبارەت بە چیرۆك و بەسەرهاتی ( حَاطِب بْن أَبِي بَلْتَعَة ﷺ ) و نامە ناردنی بۆ بێباوەڕ و کافرەکان سەبارەت بە پێلانی

---

[1] ( مجموع الفتاوى ، لابن تيمية : ١٠/ ٣٢٩ ـ ٣٣٠ ) .

[2] ( الدرر السنية في الأجوبة النجدية ، الرقمية : ١٠ / ٤٣٢ ـ ٤٣٣ ) .

پەیامبەری خوا دژیان ، دەڵێت دوای ئەوەی نامەکەمان لەو ئافرەتە وەرگرت کە ڕاسپێردرابوو بە گەیاندی ، و هێنامانە خزمەت پەیامبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( چی پاڵنەرت بوو بۆ ئەوەی کە کردت ؟ )) ، ( حَاْطِب ) وتی : سوێند بەخوا هیچ شتێکم تێدا نییە کە وام لێبکات باوەڕم بە خوای پەوەردگار و پەیامبەرەکەی نەبێت ﷺ ، و هیچیش نەگۆڕاوم ، بە هۆی کوفر و هەڵگەڕانەوە نییە ئەوەم کردبێت ، و ڕازیبوو بێتم بە کوفر پاش موسوڵمان بوونم ، و وەکو خیانەتێکیش نەمکردووە لە پەیامبەری خوا ﷺ ، نەش وەك دووڕوییەك ، دڵنیاش بوومە کە خوای پەروەردگار پەیامبەرەکەی سەردەخات و فەرمانی خۆی جێبەجێ دەکات ... بەڵام من کەسێکی لکاوبوون بە قورەیشەوە ، و لەخودی خۆی نەبووم ، لەکاتێکدا کە هەموو ئەوانەی کە کۆچیان کردبوو لەگەڵتدا هەموو خزم و خێش و پشتێکی هەبوو لە مەککەدا ، کەس و کار و ماڵو سامانەکەی بپارێزێت ، بۆیە منیش حەزم کرد ئەگەر نەسەبێکم نەبێت تیایاندا ئەوا دەستێکم هەبێت کەس و کارەکەمی پێبپارێزم ... پەیامبەری خواش ﷺ بەهاوەڵانی فەرموو : « ڕاست دەکات ، بۆیە جگە لە چاکە نەبێت هیچی تری پێمەڵێن » ... ، چونکە لەوانەیە سەیری دڵی ئەهلی بەدری کردبێت و فەرموویێتی : چیتان دەوێت بیکەن ، چونکە من لێتان خۆشبووم و بەهەشتان بۆ هەیە ، دواتر ئایەتی سەرەتای سورەتی ( الْـمُمْتَحِنَـة ) هاتەخوارەوە ﴿ يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَاءَ تُلْقُونَ إِلَيْهِمْ بِالْمَوَدَّةِ ... ﴾ [ الممتحنة : ١ ] )) [1] .

ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە دەبێت : هەوڵی دڵنیابوون بدەین لەوەی ئەو کەسە دیاریکراو و تایبەتەی کە کوفرەی لێکەوتووەتەوە مەرجەکانی تەکفیری تێدایە ، و هیچ ڕێگریەك نیە لە پێش تەکفیرکردنیدا ، چونکە نابێت بە گومان موسوڵمان تەکفیر بکرێت ، بەتایبەت لەو کردارانەی کە دوولایەنەیە و ئەگەری کوفر و تاوانیشی لێدەکرێت ، تاکو ڕوونکردنەوەی پێویست لە ئەنجامدەرەکەی وەرنەگرین ، هاوشێوەی کاری پەیامبەری خوا ﷺ لەگەڵ ( حَاْطِب ) ـدا رضي الله عنه .

پێشەوا ( الشَّاْفِعِي ) . رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى . فەرموویەتی : لەم فەرموودەیەدا لەگەڵ ئەوەی کە ڕوونمان کردەوە سودی ئەوەش هەیە کە دەبێت واز لە حوکمدان بهێنین لەگەڵ بوونی ئەگەر و گومان ، چونکە ئەو نامەیەی کە نووسیبووی ئەگەری ئەوەی هەیە بەو شێوە بێت کە ( حَاْطَب رضي الله عنه ) وتی ، ئەویش ئەوەبوو کە ئەو ئەو کارەی وەکو گومانی لە ئیسلام ئەنجام نەدا ، بەڵکو بۆ پاراستنی کەس و کارەکەی بوو ، و ئەگەری ئەوەشی هەیە کە وەکو هەڵەیەك بوو بێت نەك دژایەتیکردنێك بێت بۆ ئیسلام ، و

---

[1] رواه البخاري ومسلم ، أما الزيادات كلها صحيحة ثابتة في البخاري ، وفي موارد الظمآن ، للألباني .

ئەگەری مانای خراپتریشی هەبێت ، بۆیە وتە وتەی ئەو بوو لە دیاریکردنی مەبەستی ئەنجامدانی بۆ ئەو کارە ، لەبەر ئەوەش پەیامبەری خوا ﷺ حوکمی نەدا بە کوشتنی [(١)] .

و پێشەوا ( ابْنُ تَيْمِيَّة ) ـەش ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ فەرموویەتی : (( بێگومان تەکفیرکردن بە شتێك نابێت کە ئەگەری تری هەبێت جگە لە کوفر )) [(٢)] .

پێشەوا ( ابْنُ حَزْمٍ الْأَنْدَلُسِيُّ ) ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ فەرموویەتی : (( بێگومان هەموو ئەوانەی کە ئیسلامەتیان جێگیر دەبێت ، ئەوا لێیان وەرناگیرێتەوە و لا نابرێت ئیللا بە دەقێك یان بە کۆدەنگی زانایان نەبێت ، ئەما بە لافلێدان و بوهتان بۆ کردن ئەوە نابێت )) [(٢)] .

پێشەوا ( ابْنُ تَيْمِيَّةَ ) ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ : (( و جاری واش هەیە کە مرۆڤ خۆشویستنی بۆیان دەبێت لەبەر پەیوەندی ڕەحم ، یان پێویستیەك ، بەوەش تاوانێك دەبێت باوەڕی کەمدەکاتەوە ، نەك ئەوەی کە کوفر بێت ، هەروەکو بۆ ( حَاطِب بْن أَبِي بَلْتَعَة رضي الله عنه ) ڕوویدا کە نوسراوێکی بۆ بێباوەڕان نووسی هەندێك هەواڵی پەیامبەری ﷺ تێدا بوو بۆ بێباوەڕان ، ... )) [(٣)] .

و شێخ ( عَبْدُاللَّطِيْفِ بْنُ عَبْدِالرَّحْمَنِ بْنِ حَسَنِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِالْوَهَّابِ ) ـ رَحِمَهُمُ اللَّهُ تَعَالَى أَجْمَعِيْنَ ـ سەبارەت بە سودەکانی بەسەرهاتی ( حَاطِب بْن أَبِي بَلْتَعَة رضي الله عنه ) فەرموویەتی : (( پەیامبەری خوا ﷺ کە پێی فەرموو : « صَدَقَكُمْ ، خَلُّوا سَبِيْلَهُ » ، ڕوون و ئاشکرایە لەوەی کە بەو کارە کافر نابێت ، ئەگەر باوەڕی بە خوای پەروەردگار و پەیامبەرەکەی ﷺ هەبێت و هیچ گومان و دوو دڵیەکی لێیان نەبێت ، بەڵام ئەو تەنها لەبەر مەبەستێکی دونیایی ئەو کارەی کردووە ، چونکە ئەگەر کافر ببایە ، ئەوە پێنەدەوترا : « خَلُّوا سَبِيْلَهُ » )) [(٣)] .

---

(١) ( كتاب الأم ، للإمام الشَّافعي : ٤ / ٢٥٠ ) .

(٢) ( الصارم المسلول ، لشيخ الإسلام ابن تيمية : ٣ / ٩٦٣ ) .

(٢) ( الفصل في الملل والاهواء والنحل ، لابن حزم الأندلسي : ٣ / ١٣٨ ) .

(٣) ( مجموع الفتاوى ، لابن تيمية : ٧ / ٥٢٢ ـ ٥٢٣ ) .

(٣) ( الدرر السنية : ١ / ٤٧٣ ) .

## مەرجەكانی تەكفیر :

مەرجەکانی تەکفیر چەند مەرجێکن ، ئەوانیش :

**مەرجی یەكەم : دڵنیابوون لەوەی كە تاكە دیاریكراوەكە كەوتووەتە كوفر و بێباوەڕیەوە .**

**مەرجی دووەم : دڵنیابوون و زانینی ئەوەی كە ئەو بیروباوەڕ و وتە و كردەوەیەی كە تاكی دیاریكراو و تاییەتی تێكەوتووە كوفر و بێباوەڕی گەورەیە و هیچ گومانێكی تێدا نیە لە ڕووی شەرعەوە .**

**مەرجی سێیەم : بوونی بەڵگەی ڕوون و ئاشكرای قورئانی پیرۆز و سوننەتی صەحیحی پەیامبەرمان ﷺ لەسەر كوفر و بێباوەڕێتی ئەو بیروباوەڕ و گوفتار و كردارەی كە تاكی دیاریكرا و تاییەتی تێكەوتووە .**

**مەرجی چوارەم : دەبێت ئەو تاكە موسوڵمانەی كە توشی كوفر و بێباوەڕیەكە بووە لەوانە بێت كە تەكلیفی شەرعیان لەسەر شانە ـ واتە : ژیر و پێگەیشتوو بێت ـ .**

**مەرجی پێنجەم : بوونی مەبەست ـ واتە : مەبەستی وتە یان كردەوە كوفریەكە ـ .**

**مەرجی شەشەم : دەبێت ئیقامە حوججەی لەسەر بكرێت ـ بە پێگەیشتن و لێتێگەیشتنی ـ لەو پرس و باسانەدا كە پێویستیان بە ئیقامە حوججە هەیە .**

وردەکاری و تاوتوێکردنی مەرجەکانی تەکفیرکردن بەم شێوەیەی خوارەوەیە :

**مەرجی یەكەم : دڵنیابوون لەوەی كە تاكە دیاریكراوەكە كەوتووەتە كوفرەوە :**

بەڵگە وتەی خوای پەروەردگارە کە فەرموویەتی : ﴿ وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ ﴾ [ الإسراء : ٣٦ ] ، واتە : ئەی مرۆڤ نەكەی شوێنی شتێك بكەویت كەزانستت لە بارەیەوە نیە ، بەڵكو دڵنیابە لەشتەكان وجێگیربە لەبارەیانەوە .

و لە فەرمودەشدا بەڵگەی ئەم بەمەرجگرتنە فەرموودەی ( جُنَاْدَة ) ـی کوڕی ( أَبِي أُمَيَّة ) یە ، کە فەرموویەتی : ڕۆشتینە لای ( عُبَاْدَةَ بْنِ الصَّاْمِتِ رضي الله عنه ) لە کاتێکدا کە نەخۆش بوو ، ئێمەش پێمان وت : خوای پەروەردگار چاکەت بۆ بکات ، فەرموودەیەکمان بۆ بگێڕەوە کە لە پەیامبەری خواوە ﷺ بیستبێتت و خوای پەروەردگار بیکات بە مایەی سودمەندبوونمان ، ئەویش فەرمووی : پەیامبەری خوا ﷺ بانگی کردین ، و ئێمەش بەیعەت و پەیمانمان پێدا ، لەو شتانەش کە بەیعەت و پەیمانی لێوەرگرتین و بەمەرجی گرتن ئەوەبوو : (( أَنْ بَاْيَعَنَاْ عَلَى السَّمْعِ وَالطَّاْعَةِ فِي مَنْشَطِنَاْ وَمَكْرَهِنَاْ ، وَعُسْرِنَاْ وَيُسْرِنَاْ ، وَأَثَرَةٍ عَلَيْنَاْ ، وَأَنْ لَا نُنَاْزِعَ الْأَمْرَ أَهْلَهُ [ وَفِي رِوَاْيَةٍ : وَإِنْ أَكَلُوا مَاْلَكَ ، وَضَرَبُوا ظَهْرَكَ ] ، **إِلاَّ أَنْ تَرَوْا** ... ))[1] ، واتە : بەیعەتمان پێدا لەسەر گوێبیستبوون و گوێڕایەڵیکردن کاربەدەستان لەوەی کە پێمان خۆشە و لەوەش

[1] رواه البخاري ومسلم ، والزيادة في الصحيحة ، برقم : ٣٤١٨ .

کە پێمان ناخۆشە ، لە دژواری و نارەحەتی ، و خۆشگوزەرانی و ئاسانکاریدا ، و لەو کاتەش کە خەڵکانی تر پێشدەخرێن لەسەرمان ، و لەسەر ئەوەش کە هەوڵمان ئەوە نەبێت کە ئەمارەت و دەسەڵاتیان لێبسێنینەوە ، ئەگەرچی ماڵ و سامانمان بخوات و لەپشتیشمان بدات ، ئیللا لەو بار و حاڵەدا نەبێت کە کوفرێکی یەکلای گەورەی **بەئاشکرای لێببینرێت** ، ... .

زانایان دڵنیابوون لە هەواڵی ئەوەی کە تاکی دیاریکراوی تێکەوتووە لە کوفر و بێباوەڕی بە پێویست زانیوە ، و فەرموویانە نابێت لەو کارەدا متمانە بکرێتە سەر وتی وتی ، و هەواڵی بێبنەوا ، مەرجی ئەم پرس و باسەشیان دوو مەرجە : یەکەمیان : دانپیانان و ئیعتیرافی کەسەکەیە . ئەگەر نە ، دووەم : بە بەڵگە دەبێت کە ئەویش شایەتی دانی دوو کەسی عەدل و متمانە لەسەر کراون ... پێشەوا ( ابْنِ قُدَاْمَةَ ) .رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى. لەم بارەیەوە فەرموویەتی : (( شایەتیدان لەسەر پاشگەزبوونەوە و هەڵگەڕانەوە لە ئایین وەردەگیرێت کاتێك لە دوو کەسی عەدالەت بێت ، لە وتەی زۆرینەی خاوەن زاناکانەوە ، و هەر ئەمەشە وتەی پێشەوایان : ( مَاْلِك ) ، و ( الْأَوْزَاْعِي ) ، و ( الشَّاْفِعِي ) ، و ( أَصْحَاْب الرَّأْي ) یش ، ( ابْنُ الْمُنْذِر ) فەرموویەتی : هیچ کەسێکیشمان نەبینویە پێچەوانەیان بووبێتەوە لەسەر ئەو بۆچوونە جگە لە حەسەنی بەصری نەبێت ـ کە لەوە زیاتری بە پێویست زانیوە ـ ، ... )) .

بەڵکو شێخی پایەبەرزی ئیسلام ( ابْنُ تَيْمِيَّةَ ) .رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى. فەرموویەتی : (( بۆچوون و مەزهەبی پێشەوایان ( الشَّاْفِعِي وَأَبو حَنِيْفَة ) ـە و هەروەها ( أَحْمَدَ ) یش ـ لە وتەی بەربڵاو لێیەوە ـ فەرموویانە : ئەگەر یەکێك شایەتی ئاشکرای لەسەر بدرێت بەوەی کە پاشگەزبووەتەوە و هەڵگەڕاوەتەوە ، کەچی خۆی نکوڵی لەو شایەتیدانە بکات ، و هەردوو شایەتومانە متمانەکراوەکە بڵێتەوە ، ئەوا حوکمی موسوڵمانێتی لەسەر دەدرێت ، و پێویست بەوە ناکات دانبنات بەوەی کە شایەتی لەسەر دراوە ، ئەی چۆن دەبێت گەر هەر کەسانی متمانە لەسەر کراو شایەتی لەسەر نەدەن ؟! )) [٣] .

و لە بەیاننامەی کۆربەندی گەورە زانایانی میرنشینی سعودیەدا هاتووە : (( برگەی وتەی پەیامبەری خوا ﷺ کە فەرموویەتی : « إِلَّا أَنْ تَرَوا » ئەوەی لێدەخوێنرێتەوە و سودی ئەوەی لێوەر دەگیرێت کە : تەنها گومان و پڕوپاگەندە بۆ ئەو کارە بەس نییە )) [٣] .

---

[٣] [ مجموع الفتاوى ، لابن تيمية : ٣٥ / ٢٠٥ ] .

[٣] في دورته التاسعة والأربعين المنعقدة في : ( ٢ / ٤ / ١٤١٩هـ ) ، برئاسة الشيخ ابن باز .رَحِمَهُ اللَّهُ..

**دووەم : دڵنیابوون و زانینی ئەوەی کە ئەو بیروباوەڕ و وتە و کردەوەیەی کە تاکی دیاریکراو و تایبەتی تێکەوتووە کوفر و بێباوەڕی گەورەیە و هیچ گومانێکی تێدا نیە لە ڕووی شەرعەوە :**

بەڵگە هەمان فەرموودەی مەرجی پێشووە واتە فەرموودەی ( جُنَـادَةَ ) ـی کوڕی ( أَبِـي أُمَيَّـةَ ) یە ، کە تێیدا هاتووە فەرموویەتی : (( « ... ، **إِلَّا أَنْ تَرَوْا كُفْراً بَوَاحاً** ... » )) [١] ، واتە : ئیللا لەو بار و حاڵەدا نەبێت کە کوفرێکی یەکلای گەورەی بەئاشکرای لێببینرێت ، ... .

لە بەیاننامەی کۆڕبەندی دەستەی گەورە زانایان لە میرنشینی سعودیە هاتووە : (( مەرج نییە هەموو ئەوەی کە وەسفکراوە بە کوفر ـ لە گوفتار بێت یان کردار ـ کوفری گەورە بێت ئەنجامدەرەکەی لە ئایینی ئیسلام بباتەدەرەوە . و لەبەر ئەوەش کە حوکمی تەکفیرکردن دەگەڕێتەوە بۆ لای خوای پەروەردگار ، و پەیامبەرەکەیەتی ﷺ ، دروست نییە کەس تەکفیر بکەین ئیللا ئەوە نەبێت کە قورئان و سوننەت بەڵگەی ڕوونن لەسەر کافرێتی ، و گومانی پەتیش بەس نییە بۆ ئەو کارە ، لەبەر ئەو ئاکام و ئەحکامە ترسناکانەی کە لێی دەکەوێتەوە ... ، بۆیە پەیامبەری خوا ﷺ ڕێگری کردووە لە بەرنگاربوونەوەی کاربەدەستان و لێدەرچوونیان ، و فەرموویەتی : ئیللا لە حاڵ و بارێکدا (( إِلَّا أَنْ تَرَوا كُفْراً بَوَاْحاً عِنْدَكُمْ فِيْهِ مِنَ اللَّـهِ بُرْهَاْنٌ )) ، ... جا کە فەرموویەتی : (( كُفْراً )) ، واتە : تاوان بەس نییە ئەگەرچی گەورەش بێت ، وەکو ستەم و خواردنەوەی مەی و قومارکردن ، خۆلەپێشتردانانی حەرام .

و کە فەرموویەتی : (( بَوَاْحاً )) ، واتە : ئەو کوفرە بەس نییە کە بەواح نییە ، واتە : ڕوون و ئاشکراو و ڕاشکاو نییە ... . ئەم هەموو کۆت و خاڵانە هەموو بەڵگەن لەسەر ترسناکی کردارەکە )) [١] .

و شێخ ( عَبْدُاللَّطِيْفِ بْنُ عَبْدِالرَّحْمَنِ ) لە نوسینێکیدا پەیڕەوی باپیری شێخ ( مُـحَمَّدِ بْنِ عَبْدِالْوَهَّاْبِ ) . رَحِمَهُمُ اللَّهُ تَعَالَى أَجْمَعِيْن. ڕوونەکاتەوە و دەفەرموێت : (( بێگومان ئەو هیچ کەسێك تەکفیر ناکات ئیللا بەوە نەبێت کە موسوڵمانان کۆڕان لەسەر تەکفیرکردنی ئەنجامدەرەکەی لە هاوەڵبڕیاردانی گەورە ، و کوفرکردن بە ئایەتەکانی خوای پەروەردگار و پەیامبەرانی ، یان بە شتێك لەوانە ، ئەوەش پاش ئیقامە حوججە کردنەسەری ، و پێگەیشتنی ئەوەی کە حیسابی بۆ دەکرێت ... )) [٥] .

---

[١] تقدم تـخريـجه فـي الـحديث السابع .

[١] فـي دورته (٤٩) ، الـمنعقدة فـي : ( ٢/ ٤/ ١٤١٩هـ ) ، برئاسة الشيخ ابن باز . رَحِمَهُ اللَّهُ . .

[٥] ينظر : ( الدرر السنية : ١/ ٤٦٧ ـ ٤٦٩ ) .

و شێخ ( عَبْدُاللَّهِ ) ـی کوڕی ( عَبْدالرَّحْمَن ) ، ناسراو بە ( أَبَاْبَطِيْن ) .رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى. فەرموویەتی : (( ئەوەی کە زانایان ڕاجیاوازن تێیدا کە کوفرە یان نە ، ئیحتیات بۆ ئایین ئەوەیە کە تێیدا بوەستین و ئەنجامی نەدەین ، مادام هیچ دەقێکی ڕاشکاو نییە لە پرس و باسەکەدا لە پەیامبەری خواوە ﷺ ، کەچی شەیتان زۆرینەی خەڵکی بە هەڵەدا بردووە لەم پرس و باسەدا ، ... )) [١] .

**سێیەم : بوونی بەڵگەی ڕوون وئاشکرای قورئانی پیرۆز وسوننەتی صەحیحی پەیامبەرمان ﷺ لەسەر کوفرێتی ئەو بیروباوەڕ وگوفتار وکردارەی کە تاکی دیاریکرای تێکەوتووە :**

بەڵگە ئەم بەمەرج گرتنەش هەمان فەرموودەی ( جُنَادَة ) ـەی کوڕی ( أَبِي أُمَيَّة ) یە ، کە تێیدا هاتووە : (( ... ، **إِلَّا أَنْ تَرَوْا كُفْراً بَوَاحاً عِنْدَكُمْ مِنَ اللَّهِ فِيهِ بُرْهَانٌ** ، ... »)) [١] ، واتە : ئیللا لەو بار و حاڵەدا نەبێت کە کوفرێکی یەکلای گەورەی بەئاشکرای لێببینرێت ، بەڵگەی قوئانی پیرۆز و سوننەتی صەحیحی پەیامبەرتان ﷺ بە دەستەوە بێت ، بەڵگەکە یەکلا بێت و واتای تر هەڵنەگرێت [٢] .

کەواتە : حوکمی تەکفیر نادرێت بەسەر وتەی کەسی موکەللەف و کردەوەیدا و جێگیر نابێت ئیللا بە بەڵگەیەکی شەرعی نەبێت ـ کە دەقی قورئانی پیرۆز و سوننەتی صەحیحی پەیامبەرە ﷺ ـ ، چونکە کافر ئەوە کەسەیە کە خوای پەروەردگار و پەیامبەرەکەی بەکافریان داناوە .

پێشەوا ( ابْنُ تَيْمِيَّةَ ) .رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى. فەرموویەتی : (( بێگومان زاراوەی کوفر یەکێکە لە حوکمە شەرعیەکان ، و تەنها بە بەڵگە شەرعیەکان جێگیر دەبێت )) [٤] .

و فەرموویەتی : (( کوفر حوکمێکی شەرعیە لە خاوەن شەریعەتەکەوە وەردەگیرێت ، و عەقڵیش لەوانەیە بە هۆیەوە یتوانرێت ڕاست و هەڵەی وتە بزانرێت ، بەڵام مەرج نییە هەموو ئەوەی کە هەڵە بێت لە عەقڵدا کوفر بێت لە شەرعدا )) [٣] .

---

[١] ينظر : ( الدرر السنية : ١٠/ ٣٧٤ ، ٣٧٥ ) .

[١] تقدم تخريجه في الحديث السابع .

[٢] بروانة : ( شرح السنة ، للبغوي :١٠/ ٤٧ ) ، برقم : ٢٤٥٧ .

[٤] ( مجموع الفتاوى ، لابن تيمية : ١٧ / ٧٨ ) .

[٣] ( درء تعارض العقل مع النقل ، لابن تيمية : ١/ ٢٤٢ ) .

و پێشەوا ( الشَّوْكَانِي ) . رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى . فەرموویەتی : (( بزانە کە حوکمدان لەسەر تاکی موسوڵمان بە دەرکردنی لە ئایینی ئیسلام ، و چوونی بۆ ناو کوفر نابێت هیچ موسوڵمانێك ـ کە باوەڕی بەخوای پەروەردگار و ڕۆژی دوایی هەبێت ـ ئەنجامی بدات ئیللا بە بەڵگەیەکی ڕوونتر نەبێت لە خۆری ڕۆژی ڕووناك ... )) [١] .

و شێخ ( السَّعْدِي ) . رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى . فەرموویەتی : (( کوفر تەنها مافی خوای پەروەردگار و پەیامبەرەکەیەتی ﷺ ، بۆیە حوکمی کوفر نادرێت بەسەر کەسدا ئیللا ئەوە نەبێت کە خوای پەروەردگار و پەیامبەرەکەی ﷺ بەکافریان دانابێت )) [٢] .

و لە بەیاننامەی کۆڕبەندی دەستەی گەورە زانایان لە میرنشینی سعودیە هاتووە :

(( لەبەر ئەوەی کە حوکمی تەکفیرکردن دەگەڕێتەوە بۆ لای خوای پەروەردگار ، و پەیامبەرەکەی ﷺ ، بۆیە دروست نییە کەس تەکفیر بکەین ئیللا ئەوە نەبێت کە قورئان و سوننەت بەڵگەی ڕوون بن لەسەر کافرێتی ، و گومانی پەتیش بەس نییە بۆ ئەو کارە ، لەبەر ئەو ئاکام و ئەحکامە ترسناکانەی کە لێی دەکەوێتەوە ... ، بۆیە پەیامبەری خوا ﷺ ڕێگری کردووە لە بەرنگاربوونەوەی کاربەدەستان و لێدەرچوونیان ، و فەرموویەتی : ئیللا لە حاڵ و بارێکدا (( إِلَّا أَنْ تَرَوا كُفْراً بَوَاْحاً عِنْدَكُمْ فِيْهِ مِنَ اللَّـهِ بُرْهَاْنٌ )) ، واتە : دەبێت بەڵگەی ڕاشکاو هەبێت لە پرس و باسەکەدا ، بە شێوەیەك صەحیح بێت لە ڕووی جێگیربوونەوە ، و لە واتاشدا ڕاشکاو بێت ، بۆیە بەڵگەی ( ضعیف ) لە ڕووی سەنەد ، و نادیار لە ڕووی واتاوە بەس نییە .

و کە فەرموویەتی : (( مِنَ اللَّـهِ )) ، واتە : عیبرەت بە وتەی هیچ یەکێك نییە لە زانایان چەندێك پلە و پایەی هەبێت و بەرز بێت لە عیلم ئەمانەتدارێتیدا ، ئەگەر وتەکەی بەڵگەیەکی ڕاشکاو و صەحیحی نەبێت لە قورئان و سوننەتی پەیامبەرەکەیەوە ﷺ .... )) [٢] .

---

[١] ( السيل الجرار ، للشوكاني : ٤ / ٥٧٨ ) .

[٢] ( إرشاد أولي البصائر والألباب لنيل الفقه بأقرب الطرق وأيسر الأسباب ، للسعدي ، ص١٩٨ ) .

[٢] في دورته (٤٩) ، المنعقدة في ٢/ ٤/ ١٤١٩هـ ، برئاسة الشيخ ابن باز . رَحِمَهُ اللَّهُ . .

**چوارەم : دەبێت ئەو تاکە موسوڵمانەی کە توشی کوفر و بێباوەڕیەکە بووە لەوانە بێت کە تەکلیفی شەرعیان لەسەر شانە ـ واتە : ژیر و پێگەیشتوو بێت ـ :**

بەڵگەی ئەم مەرجەش فەرموودەی ( ابْنِ عَبَّاْس ) ــە ـ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَاْ ـ کە فەرموویەتی : (( لەسەر دەمی خەلافەتی عومەردا دەبێت ﷺ ئافرەتێکی شێت دەهێنن زینای کردبوو ، عومەریش ﷺ ڕاوێژیی بە خەڵکانێك کرد ، و بڕیاریدا بەوەی کە بەردباران بکرێت ، و بەلای عەلیدا ﷺ تێپەڕێنرا ، و عەلی ﷺ پرسی : ئەمە چییەتی ؟ ئەوایش وتیان : شێتەکەی خێڵی فلانە زینای کردووە ، و عومەر ﷺ فەرمانی کردووە بە بەردبارانکردنی ، ئەویش فەرمووی : بیگەڕێننەوە ، پاشان هات بۆلای عومەر ﷺ و پێی وت : ئــەی ئەمیری موسوڵمانــان ، ئایا نەتزانیوە ، یان بیــرت نایــەت کە پەیامبــەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (( رُفِعَ الْقَلَمُ عَنْ ثَلَاثٍ : عَنِ الْـمَجْنُونِ الْـمَغْلُوبِ عَلَى عَقْلِهِ ، وَعَنِ النَّائِمِ حَتَّى يَسْتَيْقِظَ ، وَعَنِ الصَّبِيِّ حَتَّى يَـحْتَلِمَ )) ، عومەریش ﷺ وتی : بەڵێ ، وتی : ئەی ئەگەر وایە ئەمە بۆ دەبێت بەردباران بکرێت لەگەڵ ئەوەی کە شێتە ؟! وتی : هیچ هۆکارێکی نییە ، ئەویش وتی : دەسا بەرەڵای بکە و بینێرەوە ، ئەویش : بەرەڵای کرد و ناردیەوە ، پاشان عومەر ﷺ دەستی کرد بە ( اللَّـهُ أَكْبَـر ) کردن [1] .

پێشەوا ( ابْنُ الْـمُنْـذِرِ ) ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ فەرموویەتی : (( هەموو ئەو زانایانەی کە ڕیوایەتمان لێیوە کردوون کۆدەنگن لەسەر ئەوەی کە شێت ئەگەر لە کاتی شێتیەکەیدا پاشگەزبووەوە لە ئایین ، حوکمی موسوڵمانە بەپێی ئەوەی کە پێشتر لەسەری بووە ، ... )) [2] .

و ( ابْنُ قُدَاْمَةَ ) ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ فەرموویەتی : (( پاشگەزبوونەوە لە ئایین حیسابی بۆ ناکرێت ئیللا لە کەسی عاقڵ و ژیرەوە نەبێت ، بەڵام ئەوەی کە عەقڵ و ژیری نییە ، وەك ئەو منداڵەی کە عەقڵ و ژیری نییە ، و کەسی شێت ، و ئەوەش کە عەقڵی نامێنێت بەهۆی لەهۆش چوونەوە ، یان خەوتن ، یان نەخۆشیەوە ، یان خواردنەوەی دەوایەکەوە کە خواردنەوەی حەڵاڵە ، ئەمانە حوکمی پاشگەزبوونەوەیان نییە ، و هیچ حوکمێك بۆ وتەکانی نییە ، بە بێ هیچ جیاوازییەك ، ... )) [1] .

---

[1] صحيح وضعيف سنن أبي داود ، برقم : ٤٣٩٩ ، والزيادة في صحيحه ، برقم : ١٠٠٣ .

[2] ( الإشـراف على مذاهب العلمـاء ، لابن الـمنذر : ٨ / ٥٨ ) .

[1] ( الـمغني ، لابن قدامة : ٩ / ٤ ) .

و پێشەوا ( النَّوَوِي ) یش .رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى. هەر لەم پرس و باسەدا فەرموویەتی : (( پاشگەز بوونەوەی منداڵ و شێت هیچ حیسابی بۆ ناکرێت ، ... )) [٣] .

**پێنجەم : بوونی مەبەست ـ واتە : مەبەستی وتە یان کردەوە کوفریەکە ـ :**

بەڵگە وتەی خوای پەروەردگارە کە فەرموویەتی : ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَقُولُوا رَاعِنَا وَقُولُوا انْظُرْنَا وَاسْمَعُوا وَلِلْكَافِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾ [ البقرة : ١٠٤ ] ، واتە : ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ، بە پەیامبەری خوا ﷺ مەڵێن : ( رَاعِنَا )، چونکە جولەکە کە ئەمەیان بەپەیامبەر ﷺ دەوت مەبەستیان قسەپێکردنی بوو ، جا ئێوە لەبری ئەوە بڵێن : ( انْظُرْنَا ) ، و گوێبیستی ئەوەش بن کە فەرمانتان پێدەکرێت ، بێگومان نکوڵیکاران سزایەکی بەئێشیان بۆ هەیە .

جولەکەکان ئەزیەتی پەیامبەری خوایان ﷺ دەدا بە وشەی : ﴿ رَٰعِنَا ﴾ ، کەچی هاوەڵانیشی هەمان وشەیان بەکاردەهێنا ، و بەبێ ئەوەی مەبەستیان ئەزیەتدانی پەیامبەر ﷺ بێت ، بەڵکو بە مەبەستێکی باش و دوور لە مەبەستەکەی جولەکە ، بۆیە بەو کارەیان کافر نەبوون ، لەبەر مەبەست چاکیان ، لەبەر ئەوەبوو خوای پەروەردگار بە ناوی باوەڕدارانەوە بانگی لێکردن لە ئایەتەکەدا .

پێشەوا ( ابْنُ تَيْمِيَّة ) .رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى. فەرموویەتی : (( بێگومان ئەگەر موسوڵمان مەبەستێکی دروستی هەبوو لە هەقی پەروەردگار ، یان پەیامبەرەکەی ﷺ ، و بەئاگا و زانا نەبوو بە مەبەستی وشەکان ، و وشەیەکی بەکارهێنا گومانی وابوو کە مانایەك دەبەخشێت ، کەچی مانایەکی تری دەبەخشی ، ئەوا بێگومان کافر نابێت ، و هەر کەسێکیش ئەم جۆرە کەسە تەکفیر بکات ، ئەوا خۆی شایستەترە بە کوفرەکە ، و پێچەوانەی قورئان و سوننەت و یەکدەنگی موسوڵمانان .

خوای پەروەردگاریش فەرموویەتی : ﴿ لَا تَقُولُواْ رَٰعِنَا ﴾ [ البقرة : ١٠٤ ] ، ئەم بڕگەیە یەکێك بووە لە ئەزیەتدانەکانی جولەکە بۆ پەیامبەری خوا ﷺ ، و موسوڵمانان ئەو مەبەستەیان نەبوو ، بۆیە خوای پەروەردگار ئەوەی لێقەدەغەکردن ، بەبێ ئەوەی تەکفیریان بکات بەو وتنە .

جا هەر کەسێك هاوشێوەی ئەم وتەیە بەرامبەر بە خوای پەروەردگار بەکاربهێنێت ئەوا تەکفیر ناکرێت ، چ جای بەرمبەر پەیامبەری خوا ﷺ بەکار بهێنرێت )) [٢] .

---

[٣] ( روضة الطالبين وعمدة المفتين ، للنووي : ١٠ / ٧١ ) .

[٢] ( الرد على البكري ، لابن تيمية : ٢ / ٦٥٩ ) .

و بەڵگەی پاڵپشتیش بۆ ئایەتەكەی سەرەوە ـ كە بوونی مەبەستی بەمەرج گرتووە بۆ تەكفیركردن ـ فەرموودەی ( أَنَسِ ) ــە كوڕی ( مَاْلِك ) ــە ﷺ ، كە باس لە هەڵەی سەرزارەكی كەسێك دەكات بە بێ بوونی مەبەست ، ئەوەش لەكاتێكدا كە لە دەشتێكی چۆڵەوانیدا كۆڵبارەكەی و ئەو ئاژەڵەشی كە لەسەریەتی لە گوزەرێكیدا ون دەبێت ، و هەرچەندە بە دواییدا دەگەڕێت هەر نایدۆزێتەوە ، و بێئومێد دەبێت لەوە و دێتەوە بۆ ژێر ئەو دارەی كە سەرەتا تێیدابوو و لەچاوەڕانی مەرگدا دەبێت ، خەوی لێدەكەوێت ، بەڵام كە لەخەو هەڵدەستی دەبینێت ئاژەڵەكەی و كۆڵبارەكەی لە پێشیدایە ، ئەویش پەلاماری ڕەشمەكەی دەدات و دەیگرێت و لەو كاتەدا كە زۆر دڵی خۆش دەبێت دەڵێت : (( اللَّهُمَّ أَنْتَ عَبْدِي وَأَنَاْ رَبُّكَ )) ، واتە : پەروەردگارا تۆ بەندەی منیت و منیش پەروەردگاری تر !! ، پەیامبەری خوا ﷺ دەفەرموێت : (( أَخْطَأَ مِنْ شِدَّةِ الْفَرَحِ )) [٣] ، واتە : هەڵەی كرد لە زۆری دڵخۆشیدا .

پێشەوا ( ابْنُ الْقَيِّم ) ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ لەم پرس و باسەدا فەرموویەتی : (( و ئەمەی كە وتمان لە ڕەچاوكردنی نیەت و مەبەستەكان لە وشە و گۆكاندا ، و ئەوەش كە هیچ حوكمێك پێویست ناكات تاكو بێژەرەكەی مەبەستی ئەوەی نەبێت ، هەروەكو چۆن دەبێت مەبەستی وتنی وشە و گۆكەی ویستی ئەوی هەبێت ، ... بەڵكو مەبەست بوونی واتاكە جەخت لەسەر كراوترە لە گۆكەی ، چونكە مەبەست ماناكەیە ، و گۆكەشی وەسیلەیە ، ئەوەش وتەی پێشەوایانی فەتوایە لە زانایانی ئیسلام ... ، و لە پێشتریش باسمان لەوەكرد كە بێگومان ئەوەی كە كۆڵبار و ئاژەڵەكەی دۆزیەوە وتی : (( اللَّهُمَّ أَنْتَ عَبْدِي وَأَنَا رَبُّك )) ، هەڵەی كرد لە زۆر دڵخۆشیدا ، نەك ئەوەی كوفری كردبێت ، ئەگەرچی كوفری ئاشكراش هات بەسەر زاریدا ، ئەوەش لەبەر ئەوەی مەبەستی وتە كوفریەكەی نەبوو )) [٢] .

شێخ ( ابْنُ عُثَيْمِيْن ) یش ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ فەرموویەتی : (( وَمِنَ الْـمَوَاْنِعِ أَنْ يَقَعَ مَاْ يُوْجِبُ الْكُفْرَ أَوِ الْفِسْقَ بِغَيْرِ إِرَاْدَةٍ مِنْهُ ، ... )) [٣] ، واتە : و لە ڕێگرەكانی تەكفیكردن ئەویە كە ئەوەی هۆكاری كوفر یان تاوانباریە بە بێ ویست و مەبەستی ئەو ڕووبدات .

---

[٣] رواه البخاري ومسلم .

[٢] ( إعلام الموقعين عن رب العالمين ، لابن القيم : ٣ / ٥٥ـ٥٦ ) .

[٣] ( مجموع الفتاوى والرسائل ، لابن عثيمين : ٣ / ٣٤٣ ) .

**شەشەم : کردنی ئیقامە حوججە لەسەر تاکی دیاریکراو ـ بە پێگەیشتن و لێتێگەیشتنی ـ لەو پرس و باسانەدا کە پێویستیان بە ئیقامە حوججە هەیە :**

بەڵگە ئەم مەرجە وتەی خوای پەروەردگارە کە فەرموویەتی : ﴿ وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّى نَبْعَثَ رَسُولًا ﴾ [ الإسراء : ١٥ ] ، واتە : خوای پەروەردگار سزای هیچ کەسێك نادات تاکو بەڵگەی بەسەردا نەسەلمێنرێت ( إقامة الحجة ) بەناردنی پەیامبەران ـ سەلامی خوایان لەسەر بێت ـ و دابەزاندنی پەرتوکوکان .

پێشەوا ( ابْنُ كَثِيْر ) . رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى . سەبارەت بە ئایەتەکە فەرموویەتی : (( هەواڵدانە لە دادپەروەرێتی پەروەردگار ، و ئەوەش کە هیچ کەسێك سزا نادات ئیللا لەپاش ئەوە نەبێت کە ئیقامە حوججەی لەسەر بکرێت ، بە ناردنی پەیامبەران )) [٤] .

و پێشەوا ( الشَّاطِبِي ) . رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى . فەرموویەتی : (( یەکێك لەوانە ـ واتە : لە بنەوا گشتیەکان ـ لێنەگرتن و سزانەدانە پێش ئاگادارکردنەوە ، و بەڵگەی ئەوەش هەواڵدانێتی لەسەر خۆی بەوەی کە فەرموویەتی : ﴿ وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّى نَبْعَثَ رَسُولًا ﴾ ، بۆیە سوننەت و عادەتی لە دروستکراوەکانی بەو شێوەیە بووە کە لێگرتن و سزای نەبێت لەسەر سەرپێچیەکان ئیللا پاش ناردنی پەیامبەران نەبێت ، ... )) [٥] .

و پێشەوا ( الطَّبَرِي ) . رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى . فەرموویەتی : (( خوای پەروەردگار فەرموویەتی : لەناوبەری هیچ گەلێك نین ئیللا پاش ئەوە نەبێت کە ئاگادارمان کردوونەتەوە بە پەیامبەران ، و ئیقامەحوججە کردن لەسەریان بە ئایەتەکانمان کە عوزر و بیانوویان دەبڕێتەوە ... )) [١] .

و شێخ ( الشَّنْقِيْطِي ) . رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى. فەرموویەتی : (( بێگومان خوای پەروەردگار هیچ کەسێك لە دروستکراوەکانی نە لە دونیا و نەش لە دواڕۆژدا سزا نادات تاکو پەیامبەرێکیان بۆ نەنێرێت ئاگاداریان بکاتەوە و بیانترسێنێت )) [٣] .

---

[٤] ( تفسير القرآن العظيم ، لابن كثير : ٣ / ٢ ) .

[٥] ( الموافقات ، للشاطبي : ٤ / ٢٠٠ ) .

[١] ( تفسير الطبري : ١٥/ ٥٢٦ـ٥٢٧ ) .

[٣] ( أضواء البيان ، للشنقيطي : ٣/ ٤٣٩ ) .

و بەڵگەش لە سوننەتدا لەسەر ئەم مەرجە : فەرموودەی ( الْأَسْوَد ) ــی كوڕی ( سَرِيع ) ــە ﷺ دەگێڕێتەوە كە پەیامبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (( چوار جۆرە خەڵك لە ڕۆژی دواییدا دەهێنرێن ، كەسانی كەڕ كە هیچ نابیستن ، و كەسانی گێل ، و كەسانی پیر و پەككەوتە ، كەسانێك كە لە نێو دوو پەیامبەردا بوون و پەیامی خوایی تێدا نەماوە بۆ ئەوەی پێیان بگات ، و هەموو ئەوانە بەڵگە و بەهانەی خۆیان دەخەنەڕوو ، كەڕەكان دەڵێن : ئێمە كە ئیسلام هات هیچمان نەدەبیست ، گێلەكانیش دەڵێن : پەروەردگارا كە ئیسلام هات من منداڵەكان بە پشقڵ لێیان دەدام ، و پیرەكانیش دەڵێن : ئێمەش ئەی پەروەردگار كاتێك ئیسلام هات هیچ تێنەدەگەشتین ، ئەما ئەوەانەش كە لە نێوان دوو پەیامبەردا مردبوون دەڵێن : هیچ پەیامبەرێكم لە تۆوە بۆ نەهاتووە ، لەو كاتەشدا خوای پەروەردگار تاقیان دەكاتەوە ، جا هەر یەكە و بەپێی ئەوەی كە لەسەریان نووسراوە لە خۆشبەختی و شەقاوەت دابەش دەبن ، بەهەشتیان بۆ بەهەشت و ئەوەش كە شایستەی دۆزەخ بێت ڕادەكێشرێت و دەخرێتە ناویەوە ... )) [٢] .

كەواتە نەزانین یەكێك لە بەهانەكان كە ڕێگرە لە حوكمدان بە كافرێتی موكەللەفەكان ، و ڕێگرە لە سزا دانیان لە دونیا و دوارۆژدا : جەهل و نەزانینیانە بە ئەحكامە شەرعیەكان ، ئەوەش لەبەر نەگەیشتنی بەڵگە و ئیقامە نەكردنی حوجە لەسەریان .

پێشەوا ( ابْنُ تَيْمِيَّة ) ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ فەرموویەتی : (( خوای پەروەردگار سزای كەس نادات تاكو پەیامبەرەیكی بۆ نەنێرێت ، ... بۆیە هەر كەسێك لە دونیادا بانگەشەی پێنەگات ، ئەوا لە دوارۆژدا تاقیدەكرێتەوە ، ... و هەرگیز خوای پەروەردگار هیچ كەسێك بە ئاگر سزا نادات ئیللا پاش ئەوە نەبێت كە پەیامبەرێكی بۆ دەنێرێت ، جا ئەوانەی كە بانگەشەی پەیامبەرانی پێنەگات وەك منداڵ و شێت و كەسێك كە لە نێوان دوو پەیامبەردا مردبێت ، ئا ئەمانە تاقیدەكرێنەوە لە ڕۆژی دواییدا ، هەروەكو لە هەندێك ئاسار و فەرموودەدا هاتووە )) [٣] .

و هەر ئەم پێشەوایە ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ فەرموویەتی : (( قورئان و سوونەت بەڵگەن لەسەر ئەوەی كە : بێگومان خوای پەروەردگار سزایی كەس نادات ئیللا پاش پێگەیشتنی پەیامەكەی نەبێت ، بۆیە ئەو كەسەی كە بە گشتی پەیامی پێنەگەشتبێت ئەوا ڕاستەوخۆ سزای نادات ، و ئەوەش كە بە گشتی

---

[٢] رواه أحمد في مسنده ، برقم : ١٦٣٠١ ، والزيادات كلها في الصَّحِيحَة ، برقم : ١٤٣٤ ، ٢٤٦٨ ، وغيرها .

[٣] ( مجموع الفتاوى ، لابن تيمية : ١٤ / ٤٧٧ ) .

پێیبگات بەبێ وردەکاری پرس و باسەکان ئەوا سزایی نادا لەسەر ئەوە نەبێت کە ئیقامە حوججەی لەسەر کراوە )) [٣] .

هەروەها فەرموویەتی : (( جا ئەگەر ئەمە زانرا ، ئەوا تەکفیرکردنی کەسی تایبەت و دیاریکراو لەو خەڵکە نەزانە و هاوشێوەکانیان ، بە شێوەیەك حوکمی لەسەر بدرێت کە ئەو کەسە لە کافرەکانە ، نابێت ئەنجام بدرێت ئیللا پاش ئیقامە حوججە نەبێت لەسەری بە شێوەیەك ئەوە ئاشکرا ببێت کە ئەو پێچەوانەی پەیامبەرانە ، ئەگەرچی وتەکەی کوفرێك بێت کە گومانی تێیدا نییە ، ئەم وتەیەش سەبارەت بە هەموو تەکفیرکردنە تایبەت و دیاریکراوەکانە ، ... بۆیە بۆ هیچ کەسێك نییە لە موسوڵمانان کەسێکی تر لەموسوڵمانان تەکفیر بکات ، ئەگەرچی هەڵە بکات تاکو ئیقامە حوججەی لەسەر نەکرێت ، و بەڵگەکانی بۆ ڕوون نەکرێتەوە ، و ئەو کەسەش کە دڵنیاییەوە باوەڕی جێگیربووە ، بە گومان و دوودڵی لێی ناسەندرێتەوە ، بەڵکو لێی ناسەندرێتەوە ئیللا پاش ئیقامە حوججە و لابردنی گومانەکانی نەبێت )) [١] .

و شێخ ( الْأَلْبَانِي ) یش .رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى. فەرموویەتی : (( بێگومان موسوڵمان حوکمی شتانێکی لەلا نادیار دەبێت ، و بەهۆیەوە دەکەوێتە کوفری گەورەوە ، بەڵام نازانێـ و هەستی پێ ناکات ، بۆیە لەبەر ئەوە نابێت حوکمی کوفر بدەین بەسەر موسوڵمانێکی دیاریکراو ، ئەگەرچی بکەوێتە کوفری گەورەوە ـ کوفری لە ئایین دەرچوون ـ ئیللا پاش ئیقامە حوججە لەسەر کردنی نەبێت )) [٤] .

و شێخ ( ابْنُ عُثَيْمِيْـن ) .رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى. فەرموویەتی : (( یەکێك لە گرنگترینی مەرجەکان ـ واتە : تەکفیرکردنی کەسی دیاریکراو و تایبەت ـ ئەوەیە کە زانا بێت بە پێچەوانە بوونەوەی ئەوەی کە پێی کافر دەبێت ، بە بەڵگەی : ﴿ وَمَن يُشَاقِقِ الرَّسُولَ مِن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ الْهُدَى ... ﴾ [ النساء : ١١٥] ، دەبینین بۆ سزادانی بە ئاگر مەرجی ئەوەی داناوە کە دەبێت پێچەوانە بوونەوەکەی بۆ پەیامبەری خوا ﷺ پاش ڕوونکردنەوەی هیدایەت بێت بۆی )) [٥] .

---

[٣] ( مجموع الفتاوى ، لابن تيمية : ١٢/ ٤٩٣ ) .

[١] ( مجموع الفتاوى ، لابن تيمية : ١٢/ ٥٠٠ـ٥٠١ ) .

[٤] ( موسوعة الألباني في العقيدة : ٤ / ٢٥٢ ، [ ٥٧٦ ] باب لِمَن يكون الحكم على المعين بالتكفير ؟ ) .

[٥] ( مجموع الفتاوى والرسائل ، لابن عثيمين : ٣ / ٣٤٣ ) .

**بیرخستنەوەیەکی گرنگ :**

**بێگومان یەکێك لە مەرجەکانی ئیقامەی حوججە بریتیە لە تێگەیشتن لە بەڵگەکانی قورئانی پیرۆز ، یان لە فەرموودە صەحیحەکانی پەیامبەری خوا ﷺ بە تێگەیشتنێکی ڕاست و تەندروست ، نەك بوترێت : تەنها ئەوە بەسە کە بەڵگەکانی بە گوێدا بدرێت و پێیبگات ئەگەرچی بەبێ تێگەیشتنیش بێت !!! ، چونکە کەسی وا هەیە یان هەر لە بەڵگە و دەقەکانی تێناگات ، یان بە تێگەیشتنێکی ناڕاست و هەڵەوە لێیان تێدەگات یان پێیدەگەن ، بۆیە دەبێت بەشێوەیەك ئاخاوتنی لەگەڵدا بکرێت لێیتێبگات بە شێوەیەکی گشتی و زانینی لەو پرس و باسەدا بۆ دروست بێت ، بۆیە نابێت کەسانی ئەعجەمی و غەیرە عەرەب بە زمانێکی عەرەبی لەگەڵیاندا بدوێین کە لێیتێناگەن ، یان : تەنها قورئانیان بەسەردا بخوێنرێتەوە لە کاتێکدا کە لێیتێناگەن ، پاشان بووترێت : ئیقامە حوججەی لەسەر کراوە بەو کارە ، بەڵکو دەبێت بە تێگەیشتنێکی ڕاست و تەندروست لە بەڵگەکان تێبگات .**

**پێشەوا ( ابْنُ تَيْمِيَّةَ ) ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ فەرموویەتی : بەڵام کەسی دیاریکراو کە ئەوەی وتووە نابێت حوکمی تەکفیرکردنی بەسەردا بدرێت تاکو ئیقامە حوججەی لەسەر نەکرێت ... چونکە لەوانەیە کەسەکە ئەو دەقانەی پێنەگەشتووە بۆ زانینی هەق ، یان لەلایەتی بەڵام جێگیر نییە ، یان نەیتوانیوە لێی تێبگات ، لەوانەشە گومانی هاتووەتە پێش بەوەش خوای پەروەردگار بەهانەی وەرگرێت ... ... هەر ئەمەشە کە هاوەڵانی پەیامبەری ﷺ لەسەر بووە ، لەگەڵ پێشەوایانی ئیسلام ، و پرس و باسەکانیشیان دابەش نەکردووە بۆ پرس و باسێلێك لە بیروباوەڕ کە کافر دەبێت بە نکوڵی لێکردنی ، و پرس و باسێلێك لە پەرستشەکان بە نکوڵی لێکردنی کافر نابێت [١] .**

**و شێخ ( عَبْدُ اللَّطِيْفِ ) ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ فەرموویەتی : (( و شێخمان ـ واتە : شیخ ( مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِالْوَهَّابِ ) ـ ئەمەی سەلماندووە و ڕوونی کردوەتەوە هاودەنگ لەگەڵ زانایانی ئوممەت و وەك شوێنکەوتنێك بۆیان ، و کەسی تەکفیر نەکردووە ئیللا پاش ئیقامە حوججە ، و ئاشکرابوونی بەڵگەکان نەبێت ، تەنانەت ئەو وەستاوە لە تەکفیرکردنی ئەوانەی کە گۆڕ پەرستن ، ئەگەر کەسێك نەبووبێت ئاگاداری بکاتەوە ، و هەر ئەمەشە مەبەست لە وتەی شیخ ( ابْنِ تَيْمِيَّةَ ) ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ کە فەرموویەتی تاکو ئەوەی بۆ ڕوون دەکرێتەوە کە پەیامبەرمان ﷺ پێی هاتووە ، جا ئەگەر ڕوونکردنەوەی بۆ کرا بە شێوەیەك کە وتوویژ لەگەڵ کراو لێیتێبگات و بیزانێت ، ئەوا بۆی ڕوون بووەتەوە )) [٥] .**

---

[١] ( مجموع الفتاوى ، لابن تيمية : ٢٣ / ٣٤٥ـ٣٤٦ ) .

[٥] ( مصباح الظلام في الرد على من كذب الشيخ الإمام ونسبه إلى تكفير أهل الإيمان والإسلام : ٣ / ٤٩٩ ) .

## ڕێگر و بەربەستەکانی پێش تەکفیرکردنی
## تاکی تایبەتی موسوڵمان لە دەقەکانی قورئان و سوننەت و وتەی پێشەوایان :

زۆر گرنگە پاش نانینی مەرجەکانی تەکفیر ڕێگر و بەربەستەکانی پێش تەکفیرکردنی تاکی تایبەت و دیاریکراوی موسوڵمانان لە دەقەکانی قورئانی پیرۆز و سوننەتی صەحیحی پەیامبەر ﷺ و وتەی پێشەوایان ـ بە ڕەحمەت بن ـ بزانرێت ، **کە ئەوانیش :**

**یەکەم : جەهل و نەزانین** ( الْـجَهْلُ ) :

**دووەم : کەوتنەهەڵە** ( الْـخَطَأُ ) :

**سێیەم : لەبیرچوونەوە** ( النِّسْيَانُ ) :

**چوارەم : بە زۆرەملێ پێکردن** ( الْإِكْرَاهُ ) :

**پێنجەم : هەڵەتێگەیشتن لە دەقەکانی قورئان و سوننەت** ( التَّأْوِيْلُ ) :

**شەشەم : بێ توانایی** ( الْعَجْزُ وَعَدَمُ الْقُدْرَةِ ) :

**حەوتەم : نەبوونی تەکلیف و ئەهلیەت** ( عَدَمُ التَّكْلِيْفِ وَالْأَهْلِيَّةِ ) :

تاوتوێکردن و لێکدانەوەی تاك تاکی هەموو ئەو ڕێگران و بەربەستانە بەم شێوەیەی خوارەوەیە .

**یەکەم : ڕێگر و بەربەستی جەهل و نەزانین** ( الْـجَهْلُ ) :

**جەهل چەند مانایەکی هەیە ، لەوانەش :** بەتاڵی دەروون لەزانین وزانیاری ، **یان** بیروباوەڕبوونە بە شتێك بەپێچەوانەی ئەوەی کە لەسەریەتی ، **یان** : ئەنجامدانی شتێکە بەپێچەوانەی ئەوەی کە پێویستە ئەنجام بدرێت ، ئەگەر بیروباوەری دروستی هەبێت لە ئەنجامدراوەکە یان بیروباوەری نادروست .

بەڵگەی ئەم ڕێگر و بەربەستە و ڕەچاوکردنی وتەی خوای پەروەردگار کە فەرموویەتی : ﴿ إِذْ قَالَ الْحَوَارِيُّونَ يَا عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ هَلْ يَسْتَطِيعُ رَبُّكَ أَنْ يُنَزِّلَ عَلَيْنَا مَائِدَةً مِنَ السَّمَاءِ ﴾ [ المائدة : ١١٢ ] ، واتە : حەواری و هاوەڵانی پەیامبەر عیسای کوڕی مەریەم بەپەیامبەر عیسا دەڵێن : ئایا پەروەردگاری تۆ دەتوانێت خوانێکی خواردن بە خواردنەکەیەوە لەئاسمانەوە بۆمان بنێرێتە خوارەوە ؟

پێشەوا ( ابْنُ حَزْمِ الْأَنْدَلُسِي ) .رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى. سەبارەت بە ئایەتەکە فەرموویەتی : ئەو حەواری و هاوەڵانەی کە خوای پەروەردگار وەصف و سەنای لەسەر کردبوون بە نەزانینەوە بە پەیامبەر عیسایان وت : ئایا پەروەردگاری تۆ دەتوانێت خوانێکی خواردن بەخواردنەکەیەوە لەئاسمانەوە بۆمان بنێرێتە

خوارەوە ؟ کەچی باوەڕەکەیان بەوە پوچەڵ نەبووەوە ، کەچی ئەوان کافر دەبوون ئەگەر ئەوەیان پاش ئیقامە حوجحە و ڕوونکردنەوە بوتایە [٢] .

و لە بەڵگەکانی سوننەتیش فەرموودەی ( أَبِي وَاْقِد اللَّيْثِي ) ــە ﷺ کە فەرموویەتی :

لەگەڵ پەیامبەری خوادا ﷺ دەرچووبووین بۆ حونەین ، و ئیمە تازە لە کوفر دەرچووبووین ـ کە لەپاش فەتکی مەککە موسوڵمان بووبوون ـ لەو کاتەدا بەلای بێباوەڕاندا تێپەڕین و ئەوان دارێکیان هەبوو تەبەڕوکیان پێدەکرد و لە دەوری کۆدەبوونەوە و چەکەکانیان پێوە هەڵدەواسی ، جا کە ئێمەش بەلای دارێکدا تێپەڕین وتمان : ئەی پەیامبەری خوا ﷺ درێك وەکو دارەکەی ئەوانمان بۆ دیاری بکە وەك ئەوان چۆن هەیانە ، پەیامبەری خواش ﷺ ( اللَّهُ أَكْبَرُ ) ــی کرد و فەرمووی : (( قُلْتُمْ ـ وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ ـ ، كَمَاْ قَاْلَتْ بَنُو إِسْرَاْئِيلَ لِـمُوسَى : ﴿ اجْعَلْ لَنَا إِلَهًا كَمَا لَهُمْ آلِهَةٌ قَالَ إِنَّكُمْ قَوْمٌ تَجْهَلُونَ ﴾ [ الأعراف : ١٣٨] ، لَتَرْكَبُنَّ سَنَنَ مَنْ كَاْنَ قَبْلَكُمْ ؛ سُنَّةً سُنَّةً » )) [٢] ، واتە : سوێند بەو خوایەی کە نەفسی منی بەدەستە ئەوەتان وت کە بەنی ئیسرائیل بە پەیامبەر موسایان وت : پەرستراوێکمان بۆ دابنێ هەروەکو ئەوان پەرستراوێکیان هەیە ، بێگومان ئێوە شوێنی ڕێچکە و ڕێبا ئەوانەی پێش خۆتان دەکەون ، ڕێچکە بە ڕێچکە .

پێشەوایان و زانایان ئەم فەرموودەیەیان کردووە بە بەڵگە هێنانەوەتەوە بۆ بەهانە و عوزردانان بۆ ئەوە کەسەی کە بە هۆی نەزانینەوە دەکەوێتە کوفرەوە ، بەتایبەت سەردەمانی بڵاوبوونەوەی نەزانی و کەمبوونەوەی زانستی شەرعی تەندروست لە نێو موسوڵمانانداا ، لە وتەکانیشیان :

شێخ ( سُلَيْمَاْن بْن عَبْدِاللَّهِ بْنِ مُـحَمَّدِ بْنِ عَبْدِالْوَهَّاْبِ ) ـ رَحِمَهُمُ اللَّهُ تَعَالَى ـ فەرموویەتی : (( جا ئەگەر هەندێك لە هاوەڵان ﷺ گومانیان وابوو کە ئەو کارە باشە ، و داوای ئەوەیان لە پەیامبەری خوا ﷺ کرد ، تاکو بۆی ڕوونکردنەوە کە ئەو وتەیە وەکو وتەکەی بەنی ئیسرائیلە کە بە پەیامبەر موسایان وت : ﴿ اجْعَلْ لَنَا إِلَهًا ﴾ ، پەرستراوێکمان بۆ دروست بکە ، ئەی حوکمی جگە لەوان چی دەبێت ـ لەگەڵ پەرشوبڵاوی جەهل و نەزانین ـ ؟! )) [١] .

---

[٢] ( الفصل في الـملل والأهواء والنحل ، لابن حزم : ٣ / ١٤٢ ) .

[٢] صحيح وضعيف سنن الترمذي ، ٢١٨٠ ، والـمشكاة ، برقم : ٥٤٠٨ ـ [٣٠] .

[١] ( شرح كتاب التوحيد ، ص١٥٢ ) ، نقلا عن : سعة رحمة رب العالـمين ، للغباشي ، ص ٥١ ) .

پێشەوا ( ابْنُ تَيْمِيَّة ) .رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى. فەرموویەتی : ئێمە پاش زانینی ئەوەی کە پەیامبەری خوا ﷺ پێی هاتووە بەڵگە نەویستە لامان کە بەدروستی نەزانیوە بۆ ئوممەتەکەی داوا لە هیچ مردوویەك بکەن ـ نە پەیامبەران و نەش پیاوچاکان و جگە لەوانیش ـ نە بەهاوار پێکردن و نەش خۆیەنادان پێیان ، هەروەکو سوژدەی بۆ مردوو و زیندوو و هاوشێوەیان بە شەرع نەزانیوە ، ... بەڵکو دەزانین ئەو هەموو ئەو کارانەی قەدەغەکردووە ، و هەموو ئەوانە هاوەڵبڕیاردانن کە خوای پەروەردگار و پەیامبەرەکەی حەرامیان کردووە ، بەڵام لەبەر بەربڵاوی نەزانین و کەمی زانست بە شوێنەواری پەیامی پەیامبەرمان لە زۆرێك لە پاشینان ، ناتوانین تەکفیریان بکەین بەوانە ، تاکو ئەوەیان بۆ ڕوون نەکرێتەوە کە پەیامبەری خوا ﷺ پێیهاتووە لەوەی کە پێچەوانەی بووەتەوە ، بۆیە ئەگەر ئەمە ڕوون بکرێـەوە بۆ کەسێك کە بنەواکانی ئیسلام دەزانێت ، ئیللا تێدەگات ، و دەڵێت : ئەمە بنەوای ئایینی ئیسلامە [1] .

و ( ابْنُ الْعَرَبِي ) .رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى. فەرموویەتی : (( نەزان و هەڵەکار لەم ئوممەتە ئەگەرچی کوفر و هاوەڵبڕیاردانیش ئەنجام بدات ئەوا خاوەنەکەی کافر یان هاوەڵبڕیاردەر نابێت ، چونکە عوزر و بەهانەی نەزانین و هەڵەکردنی بۆ دەهێنرێتەوە ، تاکو بەڵگەی بۆ ڕوون دەکرێتەوە ، بەوەی کە وازلێهێنەرەکەی کافر دەبێت ، ڕوونکردنەوەیەکی ئاشکرا کە تێکەڵبوونی تێدا نەبێت بۆ کەسی وەك ئەو ، ... )) [1] .

و یەکێکی تریش لە بەڵگەکانی ئەم پرس و باسە فەرموودەی ( عَبْدِاللَّـه ) ـی کوڕی ( أَبِي أَوْفَـى ) یە رضي الله عنه کە دەگێڕێتەوە : (( لە کاتێکدا کە ( مُعَاْذ ) رضي الله عنه لە شام گەڕایەوە سوژدەی بۆ پەیامبەری خوا برد ﷺ ، ئەویش پێی وت : ئەمە چییە ئەی ( مُعَاْذ ) ؟ ، ئەویش وتی : ڕۆشتم بۆ شام ، بینیم سوژدە بۆ زانا و سەرکردەکانی خۆیان دەبەن ، و منیش خۆم بۆ خۆم پێم خۆشبوو کە ئەو کارە لەگەڵ تۆدا ئەنجام بدەین ، چونکە تۆ لە پێشتری بەگەورە ڕابگیرێیت ، پەیامبەری خواش ﷺ پێی فەرموو : « ئەو کارە نەکەن ، چونکە ئەگەر من فەرمانم بە یەکێك بکردایە کە سوژدە بۆ یەکێك بەرێت ، ئەوا فەرموان بە ئافرەتان دەکرد سوژدە بۆ مێردەکەی ببات ، لەبەر گەورەیی مافەکانی بەسەریەوە » )) [1] .

بێگومان فەرموودەکە بەڵگەیەکی ڕوونە لەسەر ئەوەی کە پەیامبەری خوا ﷺ عوزر و بەهانەی نەزانینی بۆ ( مُعَاْذ ) ـی کوڕی ( جَبَل ) رضي الله عنه هێنایەوە ، بۆیە تەکفیری نەکرد ، چونکە حوکمی ئەو کارەی

---

[1] ( الرد على البكري ، لابن تيمية : ٢ / ٧٣١ ) .

[1] نقلا عن : ( تفسير القاسمي = محاسن التأويل : ٣ / ١٦١ ) .

[1] رواه أحمد ، وأبو داود ، برقم : ٢١٤٠ ، والزيادات كلها صححه الألباني في الصحيحة ، برقم : ١٢٠٣ .

نەدەزانی ئەمە لە لایەکەوە ، لەلایەکی تریشەوە ئەو کارە دوو لایەنەیە ، عیبادەتی خوای پەروەردگار و بەگەورەدانانی جگە لەوی تێدایە ـ هەروەکو لە ئوممەتانی تردا هەبووە ـ ، بەو پێیە ئەنجامدەرەکەی تەکفیر ناکرێت و هەر موسوڵمانە تاکو پرسیاری مەبەستی لێدەکرێت ، هەروەکو پەیامبەری خوا ﷺ ئەنجامیدا لەگەڵ ( مُعَاْذ ) ـی کوڕی ( جَبَل ) ـدا رضي الله عنه .

بۆیە پێشەوا ( الشَّوْكَاْنِيُّ ) . رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى. فەرموویەتی : (( هەر کەسێك بە نەزانینەوە سوژدە بۆ جگە لە خوای پەروەردگار ببات ، ئەوا تەکفیر ناکرێت )) [١] .

و پێشەوا ( ابْنُ تَيْمِيَّة ) . رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى. فەرموویەتی : (( یەکێك لە مەرجەکانی باوەڕ بوونی زانستی تەواوە ، هەربۆیە وتەی دروست ئەوەیە کە بوترێت : نەزانین بە هەندێك لە ناو و سیفەتەکانی خوای پەروەردگار خاوەنەکەی کافر ناکات ، ئەگەر دان بەوەدا بنێت کە لە پەیامبەری خواوە ﷺ هاتووە ، و ئەوەی پێ نەگەشتووە کە هۆکاری شارەزابوونیەتی بەوەی کە نایزانێت ، بەشێوەیەك کە ئەگەر ئەو زانینەی هەبوو کوفر لە حەقیدا پێویست ببێت ئەگەر ئەوەی نەزانی )) [٣] .

و هەر ئەم پێشەوایە . رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى . فەرموویەتی : (( کەسی دیاریکراو و تایبەت کە باوەڕی جێگیربووە حوکم نادرێت بە کافرێتی ئەگەر ئیقامە حوججەیەکی لەسەر نەکرێت کە کافر دەبێت ئەگەر پێچەوانەی ببێتەوە ، ئەگەرچی وتەکە خۆی لە خۆیدا کوفر بێت ، بەشێوەیەك بەنگوڵێکردنی بۆی کافر ببێت ئەگەر زانی کە پەیامبەری خوا ﷺ فەرموویەتی ... )) [٢] .

و شێخ ( ابْن سَحْمَانَ ) . رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى . لە شێخ ( مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِالْوَهَّابِ ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی : ئێمە ئەو کەسانە تەکفیرناکەین کە قوببەکەی سەر ( الْكَوَّاز ) دەپەرستن ، " ئەوەش لەبەر نەزانینیان و نەبوونی کەسانێك کە ئاگاداریان بکەونەوە [١] .

و شێخ ( مُقْبِل بْن هَادِي الْوَادِعِي ) . رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى. فەرموویەتی : (( بەڵگەکان لە قورئانی پیرۆز و سوننەتدا زۆرن لەسەر کردنی جەهڵ بە بەهانە و عوزر )) [٣] .

---

[١] ( نيل الأوطار ، للشوكاني : ٦/ ٢١٠ ) .

[٣] ( مجموع فتاوى ، لابن تيمية : ٧ : ٥٣٨ ) .

[٢] ( المستدرك على مجموع الفتاوى : ١ / ١٣٩ ) .

[١] ( الضياء الشارق فتي رد شبهات الماذق المارق ، للشيخ سليمان بن سمحان ، ص ٣٧٢ ) .

**بیرخستنەوەیەکی گرنگ :** دەبێت ئەوە بزانین ئەو کەسەی کە ئەهلییەت و هەقی ئەوەی هەیە ئیقامەی حوجەجە بکات لەسەر تاکی دیاریکرا و تایبەت ، بریتیە لە زانایان و ئەهلی عیلم .

ئەم پرسیارە کرا لە شێخ ( الْأَلْبَانِي ) .رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى. : (( حوکمی تەکفیردان لەسەر کەسی تایبەت و دیاریکراو هەقی کێیە ، ئایا هەقی زانایانە یان بۆ غەیری ئەوانە ؟ )) ، بەڕێزیشیان .رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى. فەرمووی : (( گومان لەوەدا نییە ، کە ئەو حوکمدانە مافی زانایانە نەك مافی نەزانان بێت ... ، بۆیە زانا ئەو کەسەیە کە جگە لەو بۆی نییە هەستێت بە حوکمدان بە تەکفیرکردنی موسوڵمان )) [٢] .

**دووەم : ڕێگر و بەربەستی هەڵەکردن :**

بەڵگەی ئەم ڕێگر و بەربەستە وتەی خوای پەروەردگارە کە فەرموویەتی : ﴿ لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ فِيمَا أَخْطَأْتُمْ بِهِ وَلَكِنْ مَا تَعَمَّدَتْ قُلُوبُكُمْ ... ﴾ [ الأحزاب : ٥ ] ، واتە : گوناهبارنابن لەوەی کە بەهەڵە ئەنجامتانداون و بە ئەنقەست نەبووە ، بەڵکو تەنها خوای پەروەردگار لێتاندەگرێت ئەگەر ئەوە بە ئەنقەست ئەنجامبدەن .

بەڵگەی فەرموودەش : فەرموودەی ( أَبو ذَرّ ) ـە رضي الله عنه کە دەگێڕێتەوە پەیامبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (( إِنَّ اللَّهَ تَجَاوَزَ [ أَوْ : وَضَعَ ] عَنْ أُمَّتِي الْخَطَأَ ، وَالنِّسْيَانَ ، وَمَا اسْتُكْرِهُوا عَلَيْهِ )) [١] ، واتە : بێگومان خوای پەروەردگار لێبوردەیە یان تاوانی هەڵگرتووە لەسەر ئوممەتەکەم لە هەڵەکردن و لەبیرچوونەوە و لەوەی کە بە زۆرەملێ پێیان دەکرێت .

واتای ( الْخَطَأ ) لە زمانەوانیدا : دژی دروستێتیە [١] یان بە واتای : نەبوونی مەبەست دێت ، بەڵام لە زاراوەی زانایاندا : نزیکە لە مانا زمانەوانیەکەی ، و پوختەی وتەی زانایان تێیدا ئەوەیە کە : بریتییە لە ئەوەی کە لە کەسانی موکەللەفەوە دەکەوێتەوە ، بە بێ بوونی مەبەست ، یان مەبەستیەتی لەگەڵ گومانی دروستێتی کەچی واش نییە .

---

[٣] ( فضائح ونصائح ، للوادعي ، ص ١٨٦ ) .

[٢] ( موسوعة الألباني في العقيدة : ٤ / ٢٥٢ ، [ ٥٧٦ ] باب لِمَن يكون الحكم على المعين بالتكفير ؟ ) .

[١] صحيح ابن ماجه ، برقم : ١٦٦٢ ، والإرواء ، برقم : ٨٢ ، و صحيح الجامع ، برقم : ١٧٣١ ، ١٨٣٦ .

[١] ( لسان العرب ، لابن المنظور : ٤ / ١٣٢ ) .

پێشەوا ( الْـحَاْفِظُ ابْنُ حَجَر ) . رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى . فەرموویەتی : (( هەڵەكار : ئەو كەسەیە كە مەبەستی دروستێتیە ، بەڵام جگە لەوە ڕوو دەدات )) [٢] .

و پێشەوا ( الْـحَاْفِظُ ابْنُ رَجَب ) . رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى . فەرموویەتی : ( الْـخَطَأ ) : بریتیە لەوەی كە بە كرداری مەبەستی شتێك بێت ، كەچی تووشی شتێكی تر دەبێت جگە لەوەی كە مەبەستیەتی ، وەك ئەوەی مەبەستی كوشتنی كافرێك بێت كوشتنەكەی بەر موسوڵمانێك بكەوێت ، ... ئەمەش عەفوی لەسەر دراوە ، واتە : تاوانی تێیدا نییە ، ئەوەش لەبەر ئەوەیە كە تاوان بەپێی مەبەست و نییەتەكانە ، و هەڵكاریش مەبەسی ئەو كردارەی نییە ، بۆیە تاوانی لەسەر نییە [٣] .

و پێشەوا ( الْـحَاْفِظ ابْنُ حَجَر ) . رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى . فەرموویەتی : (( ئەو هەڵانەی كە عەفوی لەسەر دراوە ، جۆری زۆرە ، هەندێكیان پەیوەستە بە ئەو گۆیانەی كە بێژەرەكەی مەبەستیانی نییە ، و دەبێتە هاتنەكایەی واتاگەلێكی قێزەون و ناقۆڵا ، خاوەنەكەی پێ كافر دەبێت ئەگەر مەبەست و نییەتی ئەو وتا قێزەون و ناقۆلایە بێت ... )) [٤] .

پێشەوا ( ابْنُ تَيْمِيَّة ) . رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى . لەم پرس و باسەدا فەرموویەتی : (( هاوەڵان و هەموو پێشەوایانی موسوڵمانان كۆڕان لەسەر ئەوەی كە مەرج نییە هەموو كەسێك كە وتەیەك دەڵێت و هەڵەی تێدا دەكات كافر بێت بەو وتەیەی ، ئەگەرچی وتەكەشی پێچەوانەی سوننەتیش بێت ، چونكە تەكفیركردنی هەموو هەڵەكارێك پێچەوانەی كۆڕای زانایانە )) [١] .

و پێشەوا ( ابْنُ الْقَيِّم ) یش . رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى . فەرموویەتی : (( لە پێشدا ئەوە خرایەڕوو كە ئەو كەسەی لەكاتی دۆزینەوەی ئاژەڵ و كۆڵبارەكەی وتی : پەروەردگارا تۆ بەندەی منیت و منیش پەروەردگاری تۆ ، هەڵەی كرد لە زۆر خۆشحاڵیدا ، و بەوە كافر نەبوو ، ئەگەرچی كوفرێكی ڕاشكاوانەی هێنا ، لەبەر ئەوەی مەبەستی ئەو وتەیەی نەبوو )) [٣] .

---

[٢] ( فتح الباري ، لابن حجر : ٥ / ١٦٠ ) .

[٣] ( جامع العلوم والـحكم ، لابن رجب ، ٣٧٥ ) .

[٤] ( فتح الباري ، لابن حجر : ١١/ ١٠ ) .

[١] ( مجموع فتاوى ، لابن تيمية : ٧ / ٦٨٥ ) .

[٣] ( إعلام الـموقعين ، لابن القيم : ٣ / ٦٣ ) .

**سێیەم : ڕێگر و بەربەستی لەبیرچوونەوە :**

بەڵگە لە قورئانی پیرۆز لەسەر ئەم ڕێگر و بەربەستە وتەی خوای پەروەردگارە کە فەرموویەتی :
﴿ رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَا إِنْ نَسِينَا أَوْ أَخْطَأْنَا ... ﴾ [ البقرة : ٢٨٦] ، واتە : ... .

بەڵگەی فەرموودەش : فەرموودەی ( أَبو ذَرّ ) ـە ﵁ کە دەگێڕێتەوە پەیامبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (( إِنَّ اللَّهَ تَجَاوَزَ [ أَوْ : وَضَعَ ] عَنْ أُمَّتِي الْخَطَأَ ، وَالنِّسْيَانَ ، وَمَا اسْتُكْرِهُوا عَلَيْهِ )) [١] ، واتە : بێگومان خوای پەروەردگار لێبوردەیە یان تاوانی هەڵگرتووە لەسەر ئوممەتەکەم لە هەڵەکردن و لەبیرچوونەوە و لەوەی کە بە زۆرەملـێ پێیان دەکرێت .

پێشەوا ( الْحَافِظُ ابْنُ رَجَب ) . رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى . فەرموویەتی : ( النِّسْيَانُ ) : بریتیە لە بیربوونی شتێك لە سەرەتادا ، و پاشان لەبیرچوونەوەی لەکاتی کرداردا ، ... ئەمەش عەفوی لەسەر دراوە ، واتە : تاوانی تێیدا نییە ، ئەوەش لەبەر ئەوەیە کە تاوان بەپێی مەبەست و نییەتەکانە ، و ئەو کەسەش کە شتەکەی لەبیرچووە مەبەستی نییە ، بۆیە تاوانی لەسەر نییە [٣] .

و پێشەوا ( ابْنُ حَجَر ) . رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى . سەبارەت بە فەرموودەکەی سەرەوە فەرموویەتی : (( ئەم فەرموودەیە فەرموودەیەکی زۆر گرانبەها و بەنرخە ، بەشێوەیەك هەندێك لە زانایان فەرموویانە : پێویستە بە نیوەی ئایینی ئیسلام دابنرێت ، چونکە کردەوە یان بە مەبەست و هەڵبژاردنەوەیە ، یان نە ، دووەمیان ئەوەیە کە بە هەڵە یان لەبیرچوونەوە یان بەزۆرەملێ پێکردن ڕوو دەدات ، ئا ئەم بەشەیان عەفوی لەسەر دراوە بەیەك دەنگی )) [١] .

**چوارەم : ڕێگر و بەربەستی بە زۆرەملێ پێکردن :**

بەڵگە وتەی خوای پەوەردگارە کە فەرموویەتی : ﴿ مَنْ كَفَرَ بِاللَّهِ مِنْ بَعْدِ إِيمَانِهِ إِلَّا مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُ مُطْمَئِنٌّ بِالْإِيمَانِ وَلَكِنْ مَنْ شَرَحَ بِالْكُفْرِ صَدْرًا ... ﴾ [ النحل : ١٠٦ ] واتە : ... .

لە ( أبو عُبَيْدَة ) ـە ( مُحَمَّد ) ی کوڕی ( عَمَّار ) ی کوڕی ( يَاسِر ) ـەوە ، ئەویش لە باوکیەوە ﵁ دەگێڕێتەوە : کە بێباوەڕان ( عَمَّارَ بْنَ يَاسِر ) یان ﵁ برد و ئەزیەتیاندا ، و وازیان لێنەهێنا تاکو جنێویدا بە پەیامبەری خوا ﷺ ، و بە چاکە باسی پەرستراوەکانی کردن ، پاشان وازیان لێهێنا ،

---

[١] صحيح ابن ماجه ، برقم : ١٦٦٢ ، والإرواء ، برقم : ٨٢ ، و صحيح الجامع ، برقم : ١٧٣١ ، ١٨٣٦ .

[٣] ( جامع العلوم والحكم ، لابن رجب ، ٣٧٥ ) .

[١] ( فتح الباري ، لابن حجر : ٥ / ١٦١ ) .

ئەویش هات بۆ لای پەیامبەری خوا ﷺ و فەرمووی : « چی ڕوویدا ؟ » ، وتی : شەر و خراپە ئەی پەیامبەری خوا ﷺ ، وازیان لێنەهێنام تاکو جنێوم پێدای ، و باسی پەرستراوەکانیانم بە چاکە کرد ، ئەویش فەرمووی : « دڵت چۆن دەبینیت ؟ » ، وتی : ئارام و پڕ لە باوەڕ ، فەرمووی : « ئەگەر ئەوان گەڕانەوە تۆش بگەڕێرەوە » )) [1] .

( الإِكْرَاهُ ) **لە زمانەوانیدا :** بریتیە لە : (( زۆرلێکردن و مەجبورکردن ، مەجبورکردنیش خۆشەویستی و رازیبوون و هەڵبژاردەی خۆی لەگەڵدا نییە )) [2] ، **لە زاراوەی زانایانیشدا :** بریتیە لە : (( ناچارکردنی بەرامبەر بەوەی کە نایەوێت )) [3] .

پێشەوا ( الشَّافِعِي ) . رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى . لەگەڵ بەڵگە هێنانەوی بەم چیرۆکەی ( عَمَّار رضي الله عنه ) فەرموویەتی : (( و ئەگەر دوژمن پیاوێکی بەدیلگرت ، زۆریان لێکرد بەوەی کە کوفر بکات ، ئەوا خێزانەکەی لێجیانابێتەوە ، و بە هیچ شتێك لە حوکمەکانی پاشگەزبوونەوە لە ئایین حوکمی لەسەر نادرێت ، چونکە هەندێك لەوانەی کە لەسەردەمی پەیامبەری خوادا ﷺ موسوڵمان بوون زۆریان لێکراوە لەسەر ئەوەی کە کوفر بکەن ئەوانیش ئەنجامیان داوە و وتویانە ، بەڵام کە هاتووە بۆ لای پەیامبەری خوا ﷺ بۆی گێڕاویەتیەوە کە بەچی سزا دراوە ، لەو کاتەدا ئەمە دابەزێنراوە ، و پەیامبەری خواش ﷺ فەرمانی پێنەکردووە بە دوورکەوتنەوەی لە هاوسەرەکەی ، و نەش بە هیچ شتێکی تر لەوەی کە پێویستە لەسەر پاشگەزبوو لە ئایین )) [4] .

پێشەوا ( الْجَصَّاصُ ) یش . رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى . سەبارەت بەم بەسەرهاتەی ( عَمَّار رضي الله عنه ) فەرموویەتی : (( ئەمە بەڵگەیە لەسەر دروستێتی دەربڕینی وشەی کوفر لە حاڵ و باری زۆرەملێدا )) [1] .

---

[1] أخرجه الحاكم في المستدرك ، برقم : ٣٣٦٢ ، وقال : (( هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ الشَّيْخَيْنِ وَلَمْ يُخْرِجَاهُ )) ، ووافقه الذهبي ، والبيهقي في السنن الكبرى ، برقم : ١٦٩٧٩ ، وفي السنن الصغرى ، برقم : ٢٥٣١ ، وقال ابن حجر في الفتح ( ١٢ : ٣١٢ ) : (( رجاله ثقات مع إرساله ، وهذه المراسيل يقوي بعضها بعضاً )) .

[2] ( انظر لسان العرب ، لابن المنظور : ١٣/ ٥٣٤ ) .

[3] ( فتح الباري ، لابن حجر : ١٢/ ٣١١ ) .

[4] ( الأم ، للشافعي : ٦ / ١٧٥ ) .

[1] ( أحكام القرآن للجصاص ط العلمية : ٣ / ٢٤٩ ) .

و پێشەوا ( ابْنُ تَيْمِيَّة ) . رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى . فەرموویەتی : (( خوای پەروەردگار ڕێگەیداوە لە کاتی زۆرەملێیدا مرۆڤ وتەی کوفر بە زمانی بڵێت ، ئەگەر دڵی ئارام بێت بە باوەڕەکەی ، بە پێچەوانەی ئەوەی کە لە دڵەوە ڕازی بێت بە کوفرەکەی و دڵی ئارام بێت بە کوفرەکە )) [١] .

و شێخ ( ابْنُ عُثَيْمِيْـن ) یش . رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى . فەرموویەتی : (( و لە ڕێگریەکان ئەوەیە کە ئەوەی کە خوازیاری کوفر یان تاوانباریە بەبێ ویستی ئەنجامدەرەکەی ڕوودات ، ئەوەش شێوەی زۆرە ، لەوانەش : زۆری لێبکرێت و ئەویش لەبەر ئەو زۆرلێکردنە ئەنجامی بدات ، نەك وەك ڕازیبوونێك پێی ، بۆیە کافر نابێت لەو کاتەدا ، ... )) [٤] ، پاشان شێخ بەڵگە بە ئایەتەکەی سەرەوە دەهێنێتەوە .

تەنانەت هەندێك لەزانایان کۆڕا ویەکدەنگیان لەم بارەیەوە گێڕاوەتەوە کە ئەگەر کەسێك زۆری لێبکرێت لەسەر کوفر وهەڕەشەی کوشتنیی لێبکرێت ، ئەوا دەتوانێت کوفر بکات ـ لەگەڵ دڵ ئارامیەوە بەو باوەڕەی کە هەیەتی ـ ، و هیچی لەسەر نییە ، لەوانەش ( ابْنُ بَطَّاْل ) . رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى . هەروەك فەرمویەتی : (( أَجْـمَعَ الْعُلَمَـاْءُ عَلَى أَنَّ مَنْ أُكْرِه عَلَى الْكُفْرِ حَتَّى خَشِيَ عَلَى نَفْسِهِ الْقَتْلَ فَكَفَرَ ، أَنَّهُ لَا إِثْمَ عَلَيْهِ إِنْ كَفَرَ ، وَقَلْبُهُ مُطْمَئِنٌّ بِالْإِيْمَـاْنِ ، وَلَا تَبِيْـنُ مِنْهُ زَوْجَتُهُ ، ولَا يُـحْكَمُ عَلَيْهِ بِالْكُفْرِ )) [١] ، وە لەوانەش پێشەوا ( الْقُرْطُبِي ) [٢] ، و ( الْبَغَـوِي ) [٣] یە . رَحِمَهُمَا اللَّهُ تَعَالَى . .

زانایـان لەگەڵ هـەڕەشە و ئەگـەری کوشتندا چـەندان شتیان بە بەهانە و بە زۆرەملێیان داناوە ، لەوانـەش : بەندکـردن ( السِّجْنُ ) ، و بەستنـەوە ( الْقَيْـدُ ) ، و ئەشکەنجـەدان و ئـازار پێگەیاندن ( التَّعْذِيْبُ ) ، و هەڕەشەدان ( الْوَعِيـدُ ) ، و ترسان لە لەناوچوونی بەشێك لە لەش [١] .

---

[١] ( الاستقامة ، لابن تيمية : ٢ / ٣١٩ ) .

[٤] ( مـجموع لفتاوى والرسائل ، لابن عثيمين : ٣ / ٣٤٣ ) .

[١] ( شـرح صحيح البخاري ، لابن بطال : ٨ / ٢٩١ ) .

[٢] ( تفسيـر القرطبي : ج ١٠ / ص ١٩٠ ) ( أحكام القرآن ، للقرطبي : ١٠ / ١٨٢ ) .

[٣] ( تفسيـر البغوي : ٥ / ٤٦ ) .

[١] بروانە : ( الـجامع لأحكام القرآن ، للقرطبي : ١٠/ ١٩٠ ) ، و ( الـمحلى بالآثار ، لابن حزم : ٧ / ٢٠٣ ) ، و ( فتح الباري ، لابن حجر : ١٢/ ٣١٤ ) ، و ( أحكام القرآن ، للجصاص : ٥ / ١٣ ) .

**پێنجەم : ڕێگر و بەربەستی هەڵەتێگەیشتن لە دەقەکانی قورئان و سوننەت :**

بەڵگە ئەم ڕێگر و بەربەستە فەرموودەی ( ابْنِ عَبَّاْس ) ــە . رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَاْ . کە دەگێڕێتەوە : لە سەردەمی خەلافەتی عومەردا دەبێت ﷺ ، یەکێکیان لە موهاجیرە یەکەمینەکان هێنا مەی خواردبووەوە ، فەرمان کرا بەوەی کە جەڵدە لێبدرێت ، ئەویش وتی : بۆ جەڵدەم لێدەدەن ؟ قورئان لە بەینی من و ئێوەدا بێت ، عومەریش پێی وت : لە کوێ قورئاندا هاتووە کە من جەڵدە لە تۆ نەدەم ؟ ئەویش وتی : خوای پەروەردگار فەرموویەتی : ﴿ لَيْسَ عَلَى الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ جُنَاحٌ فِيمَا طَعِمُوا إِذَا مَا اتَّقَوْا وَآمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ ... ﴾ [ المائدة : ٩٣ ] ، عومەر پێی وت : بە هەڵەداچووی لە تێگەیشتنت بۆ ئایەتەکە ، چونکە ئەگەر تەقوای خوات بکردبایە دووردەکەوتیتەوە لەوەی کە خوای پەروەردگار قەدەغەی کردووە لەسەرت ، ... هەتا کۆتایی بەسەرهاتەکە [١] .

**بەڵام با بزانین مەبەست لە ( التَّأْوِيْل ) چییە ؟ ، و چ جۆرێکی لێرەدا مەبەستە ؟ وکام جۆرەشیانە کە دەبێت بە ڕێگر و بەربەست لە پێش تەکفیرکردندا ؟**

( التَّأْوِيْلُ ) : جۆرێکە لە جۆرەکانی هەڵە ، و **مەبەست پێی لێرەدا :** بریتیە لە دانانی بەڵگە لە شوێنێك جگە لە شوێنەکەی دروستەکەی خۆی ، بە ئیجتیهادەوە بێت ، یان بەهۆی شوبهەیەکەوە بێت ، و **هۆکارەکەشی :** تێنەگەیشتنە لە مەبەستی دەقەکانی قورئان و سوننەت ، یان : بە هەڵە تێگەیشتنە لێیان ، تەنانەت ئەنجامدەری باوەڕی وایە کە لەسەر هەقە ، بۆیە دەکەوێتە کوفرەوە ، بە بێ ئەوەی مەبەستی پێچەوانەبوونەوەی شەرعەتی هەبێت .

بەڵام دەبێت ئەوەش بزانرێت کە لاف و گەزافی بەهانەی ( التأويل ) لە هەموو کەسێك وەرناگیرێت ، پێشەوا ( ابْنُ الْوَزِيْرِ ) . رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى . لەم بارەیەوە فەرموویەتی : (( و هەروەها جیاوازی نییە لە کافرێتی ئەو کەسەی کە نکوڵی دەکات لە شتانێك کە ئاشکرای لای هەمووانە و هەموو کەسێك دەیانزانێت ، بە حۆحەشاردان لە پشت ( التَّأْوِيْل ) ــەوە ، لەوانەی کە ناکرێت ( تَأْوِيْل ) بکرێن ، وەکو کاری موڵحیدەکان لە ( تَأْوِيْل ) ــکردنی هەموو ناوەکانی خوای پەروەردگار ، بەڵکو هەموو قورئانی پیرۆز ، شەریعەت ، ڕۆژی دوایی لە زیندوبوونەوە و هەستانەوە و بەهەشت و دۆزەخیش )) [١] .

---

[١] رواه النسائي في السنن الكبرى ، برقم : ٥٢٧٠ ، والحاكم في المستدرك ، برقم : ٨١٣٢ ، وقال : (( هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحُ الْإِسْنَادِ وَلَمْ يُخَرِّجَاهُ )) ، ووافقه الذهبي ، ورواه الطحاوي في شرح مشكل الآثار ، برقم : ٤٤٤١ ، والبيهقي في السنن الكبرى ، برقم : ١٧٥٤٣ ، والزيادة عند البيهقي في السنن الكبرى ، برقم : ١٧٥١٦ .

[١] ( إيثار الحق على الخلق في رد الخلافات ، لابن وزير ، ص ٣٧٧ ) .

و پێشەوا ( ابْنُ تَيْمِيَّة ) ـەش ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ لە مەرجی ئەم بەهانەیە فەرموویەتی : (( دەبێت لێرەدا ڕێسایەکی تر بیربخەینەوە ، ئەویش ئەوەیە کە لەوانەیە پێچەوانەکار پێچەوانەی دەقێکی موتەواتیر بێتەوە و لاف و گەزافی ئەوە لێبدات کە ئەو ( مُؤَوِّل ) ـە !!! بەڵام کەچی دەڕوانیینە ( تَأْوِيْلِه ) کەیدا دەبینین هیچ بنەوایەکی نییە لە زمانەوانیدا ، نە لە نزیك و نەش لە دوورەوە ، بۆیە ئەوە کوفرە ، و خاوەنەکەی بەدرودانەرە ، ئەگەرچی بەهانە ئەوە بهێنێتەوە کە ئەو ( مُؤَوِّل ) ـە )) [1] .

و پێشەوا ( ابْنُ حَجَر ) یش ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ سەبارەت بە مەرجەکانی ( التَّأْوِيْل ) ـی وەرگیراو فەرموویەتی : (( زانایان فەرموویانە : هەموو ( مُتَأَوِّل ) ێك عوزر و بەهانە نییە بۆ خاوەنەکەی لێی وەرناگیرێت ، و ناوتریێت : تاوانبار نییە ، ئەگەر ( تَأْوِيل ) ـەکەی لە زمانی عەرەبیدا قەبوڵ نەبێت ، و خوێندنەوە و ڕوویەکی نەبێت لە زانستی شەرعیدا )) [1] .

## شەشەم : ڕێگر و بەربەستی بێتوانایی :

بەڵگەی ئەم ڕێگرە وتەی فەرموودەی ( أَنَس ابْنِ مَالِك ) ـە ﷺ کە فەرموویەتی : (( کاتێك کە هەواڵی مردنی ( النَّجَاشِي ) هات پەیامبەری خوا ﷺ فەرمووی : « صَلُّوا عَلَيْهِ » ، وتایان : ئەی پێغەمبەری خوا نوێژ بکەین لەسەر عەبدێکی حەبەشی غەیرە موسوڵمان بکەین ؟! لەو کاتەدا خوای پەروەردگار ئایەتی : ﴿ وَإِنَّ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ لَمَنْ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَمَا أُنْزِلَ إِلَيْكُمْ وَمَا أُنْزِلَ إِلَيْهِمْ خَاشِعِينَ لِلَّهِ لَا يَشْتَرُونَ بِآيَاتِ اللَّهِ ثَمَنًا قَلِيلًا ﴾ [ آل عمران : ١٩٩ ] دابەزاند )) [1] .

پێشەوا ( الْطَبَرِيُّ ) ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ لە تەفسیرەکەیدا ( جَامِع الْبَيَان ) ، بە ژمارە : ٨٣٧٨ ، ٨٣٧٩ ، لە ( قَتَادَة ) ـەوە دەگێڕێتەوە کە ئەم ئایەتە لەسەر ( النَّجَاشِي ) و هەندێك لە هاوەڵانی هاتووەتە خوارەوە ، کە باوەڕیان هێنابوو بە پەیامبەری خوا ﷺ و بە ڕاستیان زانیبوو بە نهێنییەوە .

و لە فەرموودەی ( أَبِي هُرَيْرَةَ ) ـدا ﷺ ، هاتووە دەگێڕێتەوە : (( پەیامبەری خوا لە مەدینەدا هەواڵی مردنی نەجاشی پێگەیاندن لەو ڕۆژەی کە کۆچی کرد ، و فەرمووی : « ئەمڕۆ برایەکتان مردووە ، یان : ئەمڕۆ بەندەیەکی صالح کۆچی کردووە ، جا هەستن با نێژی لەسەر بکەین » ، وتیان : کێیە ؟

---

[1] ( بغية المرتاد ، لابن تيمية : ١/ ٣٤٦ ) .

[1] ( فتح الباري ، لابن حجر : ١٢ / ٣٠٤ ) .

[1] رواه النسائي في المعجم الأوسط ، برقم : ٢٦٦٧ ، وصححه الألباني في ( الصحيحة : ٧ / ٩٤ ـ ٩٩ ) .

فەرمووی :« نەجاشیە » ، و بردنی بۆ نوێژگە یان بۆ بەقیع ، پێشنوێژی بۆ کردن و نوێژی لەسەر کرد ، چوار ( اللَّـهُ أَكْبَـر ) ــی لەسەر کرد ، و فەرمووی :« داوای لێخۆشبوون بۆ براکەتان بکەن » )) [(١)] .

فەرموودەکە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە بێتوانایی نەجاشی و ئەوانەشی کە لەگەڵیدا بوون لە موسوڵمان لە ئاشکراکردنی دروشمەکانی ئیسلام لە نێو گەلەکەیدا ڕێگرییەکە لە ڕێگریەکانی تەکفیر ، چونکە خوای پەروەردگار تەکفیری نەکرد بەوە ، بەڵکو فەمانی بە پەیامبەرەکەی کرد ﷺ بە نوێژ لەسەرکردنی کە کۆچی دوایی کرد ، پێشەوا ( ابْنُ تَيْمِيَّة ) ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ فەرموویەتی : (( هەر کەسێك وازبێنێت لەهەندێك لەو بەشانەی باوەڕ کە پێویستن لەسەری بەهۆی بێتواناییەوە لە ئەنجامدانی ، ئەوە فەرمانی پێناکرێت بەوەی کە لە توانایدا نییە ، و ئەوەش بەشی پێویست نییە لە باوە دەرهەق بەو ، ئەگەرچی لە بنەوادا بەشێکە لە ئایین و باوەڕی پێویست )) [(٢)] .

و هەر ئەم پێشەوایە ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ فەرموویەتی : (( ... و ئەگەر بێتوانا بوو لە ئاشکراکردنی ئەو هەقەی کە دەیزانێ ، ئەمە وەك ئەو کەسەیە کە بزانێت ئایینی ئیسلام هەقە و لە نێو گاورەکان بێت ، جا ئەگەر ئەوەی ئەنجامدا کە توانای بەسەریدا هەیە ، ئەوا لێیناگیرێت لەوانەی کە لە توانایدا نییە ، نموونەی ئەوانەش وەك نەجاشی و جگە لەویش ... )) [(١)] .

و سەبارەت بە نەجاشی دەڵێت : ئێمە یەکلا دەزانین نەجاشی نەیتوانیوە حوکم بە قورئانی پیرۆز بکات لە نێوان گەڵەکەیدا ، چونکە گەلەکەی ڕازی نەدەبوون لەو کارەی ، کەچی نەجاشی و هاوشێوەکانی خۆشبەختن لە بەهەشتەکەی خوای پەروەردگار ، ئەگەرچی پابەند نەبوون بەو دروشمانەی ئیسلام کە لە توانایاندا نەبوو پابەندبوون پێوەی ، بەڵکو حوکمیان بەو حوکمانە دەکرد کە لە توانایاندا هەبوو حوکمیان پێبکەن [(١)] .

---

[(١)] قلت : الحديث رواه البخاري ومسلم وغيرهما ، ولكن ترتيب الحديث بهذا الشكل ومصادر الزيادات ، فعن ( أحكام الجنائز : ١ / ٨٩ ـ ٩١ ) ، للشيخ الألباني ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ .

[(٢)] ( مجموع فتاوى ، لابن تيمية : ١٢ / ٤٧٨ ـ ٤٧٩ ) .

[(١)] ( مجموع الفتاوى ، لابن تيمية : ٧ / ٧١ ) .

[(١)] ( مجموع الفتاوى ، لابن تيمية : ١٩ / ٢١٧ ـ ٢١٩ ) ، و ( منهاج السنة : ٥ / ١١٢ ـ ١١٤ ) .

**حەوتەم : ڕێگر و بەربەستی نەبوونی تەکلیف و ئەهلیەت ( عَدَمُ التَّكْلِيْفِ وَالْأَهْلِيَّةِ ) :**

بەڵگەی ئەم مەرجەش فەرموودەی ( ابْنِ عَبَّاس ) ـە . رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَاْ . کە فەرموویەتی : (( لەسەر دەمی خەلافەتی عومەردا دەبێت ﷛ ئافرەتێکی شێت دەهێنن زینای کردبوو ، عومەریش ﷛ ڕاوێژی بە خەڵکانێك کرد ، و بڕیاریدا بەوەی کە بەردباران بکرێت ، و بەلای عەلیدا ﷛ تێپەڕێنرا ، و عەلی ﷛ پرسی : ئەمە چییەتی ؟ ئەوایش وتیان : شێتەکەی خێڵی فلانە زینای کردووە ، و عومەر ﷛ فەرمانی کردووە بە بەردبارانکردنی ، ئەویش فەرمووی : بیگەڕێننەوە ، پاشان هات بۆلای عومەر ﷛ و پێی وت : ئـەی ئەمیری موسوڵمانـان ، ئایا نەتزانیوە ، یان بیـرت نایـەت کە پەیامبـەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (( رُفِعَ الْقَلَمُ عَنْ ثَلَاثٍ : عَنِ الْـمَجْنُونِ الْـمَغْلُوبِ عَلَى عَقْلِهِ ، وَعَنِ النَّائِمِ حَتَّى يَسْتَيْقِظَ ، وَعَنِ الصَّبِيِّ حَتَّى يَـحْتَلِمَ )) ، عومەریش ﷛ وتی : بەڵێ ، وتی : ئەی ئەگەر وایە ئەمە بۆ دەبێت بەردباران بکرێت لەگەڵ ئەوەی کە شێتە ؟! وتی : هیچ هۆکارێکی نییە ، ئەویش وتی : دەسا بەرەڵای بکە و بینێرەوە ، ئەویش : بەرەڵای کرد و ناردیەوە ، پاشان عومەر ﷛ دەستی کرد بە ( اللَّـهُ أَكْبَـر ) کردن [1] .

کەواتە منداڵێتی و باڵغ نەبوون ، و شێتی و نەبوونی عەقل بە بەردەوامی ، یان نەمانی لەکاتی ئەنجامدانی گوفتار یان کردارە کوفریەکاندا ڕێگرن و بەربەستن لەپێش تەکفیرکردنی تاکی تایبەت و دیاریکراودا ، ( ابْنُ قُدَامَةَ ) . رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى. فەرموویەتی : (( إِنَّ الرِّدَّةَ لَا تَصِحُّ إِلَّا مِنْ عَاقِلٍ ، فَأَمَّاْ مَنْ لَا عَقْلَ لَهُ ، كَالطِّفْلِ الَّذِي لَا عَقْلَ لَهُ ، وَالْـمَجْنُونِ ، وَمَنْ زَاْلَ عَقْلُهُ بِإِغْمَـاْءٍ ، أَوْ نَوْمٍ ، أَوْ مَرَضٍ ، أَوْ شُـرْبِ دَوَاْءٍ يُبَـاْحُ شُـرْبُهُ ، فَلَا تَصِحُّ رِدَّتُهُ ، وَلَا حُكْمَ لِكَلَامِهِ ، بِغَيْـرِ خِلَافٍ )) [1] .

و پێشەوا ( النَّوَوِي ) . رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى. فەرموویەتی : (( لَا تَصِحُّ رِدَّةُ صَبِيٍّ وَلَا مَـجْنُونٍ ، ... )) [3] .

تەنانەت پێشەوا ( ابْنُ الْـمُنْـذِرِ ) . رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى . فەرموویەتی : (( هەموو ئەو زانایانەی کە ڕیوایەتمان لێیەوە کردوون کۆدەنگن لەسەر ئەوەی کە شێت ئەگەر لەکاتی شێتیەکەیدا پاشگەزبووەوە لە ئایین ، حوکمی موسوڵمانە بەپێی ئەوەی کە پێشتر لەسەری بووە ، ... )) [2] .

---

[1] صحيح وضعيف سنن أبي داود ، برقم : ٤٣٩٩ ، والزيادة في صحيحه ، برقم : ١٠٠٣ .

[1] ( المغني ، لابن قدامة : ٩ / ٤ ) .

[3] ( روضة الطالبين وعمدة المفتين ، للنووي : ١٠ / ٧١ ) .

[2] ( الإشراف على مذاهب العلماء ، لابن المنذر : ٨ / ٥٨ ، برقم : م ٥١٨٣ ) .

## تەفسیری تەندروستی پێشەوایان و زانایانی پێشین

## سەبارەت بە ئایەتی : ﴿ وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ ﴾ :

زۆر گرنگە لەم پرس و باسەدا تەفسیری تەندروستی ڕاڤەوانانی قورئانی پیرۆز و پێشەوایان و زانایانی پێشین بزانین سەبارەت بە ڕاڤەی ئایەتی : ﴿ وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ ﴾ [ المائدة : ٤٤] ، ئەوەش لەبەر ئەوەی خەڵكانێكی زۆر بەداخەوە لە كۆندا ـ لە لایەن خەواریجە حەروریەكانەوە ـ ، و لەسەردەمانی ئەمڕۆشدا ـ لە لایەن شوێنكەوتووە تەكفیریەكانیان ـ ئەم ئایەتە و هاوشێوەكانی بەهەڵە بەكار دەهێنین ، و دەیكەنە بەڵگە لەسەر تەكفیركردنی گشتی كاربەدەستان و بەرپرسانی وڵاتی موسوڵمانان !!! بەڵكو لەوەش زیاتر دەكرێتە بەڵگە بۆ تەكفیركردنی ئەوانەش كە بۆچوونیان پێچەوانەی ئەو خەڵكانە بێت لە شێوازی بەبەڵگە هێناوەیان ـ ئەگەرچی زانایانیش بن ـ !!! بێگومان ئەم جۆرە بەبەڵگە هێنانەوەش ڕێچكە و ڕێبازی خەواریج و جگە لەوانیشە لە ئەهلی بیدەع و بیدعەكاران ، پێشەوا ( ابْنُ تَيْمِيَّةَ ) . رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى . فەرموویەتی : (( بێگومان هەستانی نەزان و نەفامەكان بە تەكفیركردنی زانایانی ئیسلام یەكێكە لە گەورەترینی تاوان و خراپەكاریەكان ، و بنەوای ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ خەواریج و رافیزەكان ئەوانەی كە پێشەوا و كاربەدەستانی موسوڵمانان تەكفیردەكەن ، لەبەر ئەو بیروباوەڕەیان كە بە هەڵەیان دەزانن لە ئاییندا ، و ئەهلی سوننە و جەماعەش هاودەنگن لەسەر ئەوەی كە نابێت زانایانی ئیسلام تەكفیربكرێت بە تەنها ئەوەی كە تاوانیان لێدەكەوێتەوە ، ... )) [٤] .

پاشان ـ بە پشتیوانی خوای پەروەردگار ـ لەم پرس و باسەدا هەوڵدەدەین لەچەند ڕوویەكەوە ڕوونكردنەوە بخەینە پێش دەستی خوێنەرانی بەڕێز ، ئەوەش بەم شێوەیەی خوارەوە :

**ڕوونكردنەوەی یەكەم :** سەرەتا دەبێت ئەوە بزانین كە ئەم ئایەتە لەسەر بێباوەڕنی جولەكە هاتووەتە خوارەوە ، هەروەك بە ڕوونی و ڕاشكاوی لە فەرموودەی ( الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ) [١] ، و ( ابْنِ عَبَّاس ) [١] ـدا . رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا . هاتووە .

---

[٤] ينظر : ( مـجموع الفتاوى : ٣٥ / ١٠٠ ) .

[١] رواه مسلم .

[١] الصَّحِيحَة ، برقم : ٢٥٥٢ .

پێشەوا ( الطَّبَرِي ) ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ پاش باسکردنی ڕاجیاوازی زانایان لەم بارەیەوە فەرموویەتی : لە پێشترین وتە و تەندروست ترین وتە لە وتەی زانایان وتەی ئەوانەن کە فەرموویانە : ئەم ئایەتانە سەبارەت بە بێباوەڕانی جولەکە هاتووەتە خوارەوە ، چونکە پێش و پاشی ئایەتەکە لەسەر ئەوان دابەزێنراوە ، و مەبەست بە ئایەتەکان هەواڵە سەبارەت بەوان [1] .

و شێخ ( الْأَلْبَانِي ) ـش ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ پاش هێنانەوەی وتەکەی پێشەوا ( الْطَبَرِي ) ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ فەرموویەتی : (( پوختەی وتە ئەوەیە کە ئایەتەکان سەبارەت بە نکوڵیکارانی حوکمی خوای پەروەردگار لە جولەکەکان دابەزێندراوەتە خوارەوە ، بۆیە هەر کەسێك وەکو ئەوان نکوڵیکار بێت ، ئەوا بێباوەڕ دەبێت لە بیروباوەڕیدا ، بەڵام ئەوەی کە هاوبەشیان نەبێت لە نکوڵیکردنیان ، ئەوا کوفرەکەی کرداریە ، چونکە هەمان کرداری ئەوانی کردووە ، ستەمکار دەبێت و تاوانی دەگات ، بەڵام بەو کارە لە ئیسلام دەرناچێت ، هەروەکو لە پێشتر لە وتەی ( ابْن عَبَّاْس ) ـدا ﷺ خرایەڕوو )) [1] .

و هەر شێخی ( الْأَلبَانِي ) ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ فەرموویەتی : (( ئەگەر ئەوەت زانی کە هەر سێ ئایەتەکە لەسەر جولەکەکان هاتوەتە خوارەوە ... بۆیە نابێت ئەم ئایەتانە بکرێنە بەڵگە بۆ تەکفیرکردنی کاربەدەسانی موسوڵمانان و دادوەرەکانی کە حوکم بە جگە لەوە دەکەن کە خوای پەروەردگار دایبەزاندووە لە یاسا مرۆڤکردەکان ، دەڵێم : نابێت بەو کارە تەکفیر بکرێن ، و لە ئیسلام بکرێنە دەرەوە ئەگەر باوەڕیان بە خوای پەروەردگار پەیامبەرەکەی ﷺ هەبێت ، ئەگەرچی ستەمکاربن بەو حوکمکردنیان بە جگە لەوەی کە خوای پەروەردگار دایبەزاندوە ، نابێت ئەوە بکرێت ، چونکە ئەگەرچی ئەوان لە لایەنی حوکم کردنیانەوە لەوان بچن ، ئەوا لە ڕوویەکی ترەوە جیاوازن لێیان ، کە ئەویش باوەڕبوون و بەڕاستدانانیانە بۆ ئەوەی کە خوای پەروەردگار دایبەزاندووە ، بە پێچەوانەی جولەکە کافر و بێباوەڕەکان ، کە نکوڵیان لێدەکرد ... لە پێشینەشەوە پاڵپشتی ئەم وتەیە هاتووە ، و ئەویش ئەو وتەیەیانە کە لە ڕاڤەی ئایەتەکەدا فەرموویانە : (( كُفْرٌ دُونَ كُفْرٍ )) واتە : کوفری بچووك و کرداریە ، ئەوە لە ڕاڤەوانی قورئان ( عَبْدِاللَّه ) ـی کوڕی ( عَبَّاْس ) ـەوە ﷺ هاتووە ، هەندێك لە شوێنکەوتوان و جگە لەوانیش وەریان گرتووە ، پێویستیشە هەندێك لەو ووتانە کە لێیانەوە هاتوون ـ بەپێی توانا ـ بخرێنەڕوو ، بەڵکو ببێتە ڕێنیشاندەری ڕێگا لە پێش ئەوانەی لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا

---

[1] ( تفسير الطبري : ١٠ / ٣٥٨ ) .

[1] [ الصحيحة ، للألباني : ٦ / ١١٥ ـ ١١٦ ] .

لارێبوون لەم پرس و باسە ترسناكەدا ، و بۆچوونەكانیان وەك بۆچوونی خەواریجەكانە ، ئەوانەی كە بە ئەنجامدانی تاوان موسوڵمانان تەكفیردەكەن ، ئەگەر نوێژ و ڕۆژووش بكەن !!! )) [١] .

**ڕوونكردنەوەی دووەم كە پێویستە لێرەدا بزانرێت :** ئەوەیە كە پێشەوایانی پێشین تەفسیر و ڕاڤەی ئەم ئایەتەیان بە كوفری بچووك كردووە ، ئەوە كوفرەی كە خاوەنەكەی لە ئایین ناباتە دەرەوە ، ئەوەش وەك لەم ڕیوایەتانەی خوارەوەدا هاتووە :

پێشەوا ( طَاْوُوس ) ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ ، لە ( ابْنُ عَبَّاْس ) ـ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَاْ ـ : سەبارەت بە ئایەتەكە فەرموویەتی : (( إِنَّهُ لَيْسَ بِالْكُفْرِ الَّذِي يَذْهَبُونَ إِلَيْهِ ، إِنَّهُ لَيْسَ كُفْراً يَنْقِلُ عَنْ الـمِلَّةِ .. ، كُفْرٌ دُونَ كُفْرٍ )) ، واتە : بێگومان ئەو كوفرە نییە كە ئەوان بۆی دەڕۆن ، بەڵكو ئەوە كوفرێكە موسوڵمان لە ئایین ناباتنە دەرەوە ... ، كوفری بچووكە .

و ( طَاْوُوس ) ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ لە باوكیەوە دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی : پرسیار كرا لە ( ابْنُ عَبَّاس ) ـ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَاْ ـ سەبارەت بە ئایەتەكە ، ئەویش فەرمووی : (( هُوَ بِهِ كُفْرٌ ، ولَيْسَ كَمَنْ كَفَرَ بِاللَّهِ ، وَمَلَائِكَتِهِ ، وَكُتُبِهِ ، وَرُسُلِهِ )) ، واتە : ئەو كارە كوفرە ، بەڵام وەك ئەوانە نییە كە كوفر بە خوای پەروەردگار و فریشتەكانی و كتێبەكانی و پەیامبەرانی دەكات .

و هەر لە ( ابْن عَبَّاْس ) ــەوە ـ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَاْ ـ دەگێڕنەوە فەرموویەتی : (( مَنْ جَحَدَ مَاْ أَنْزَلَ اللَّـهُ ؛ فَقَدْ كَفَرَ ، وَمَنْ أَقَرَّ بِهِ وَلَـمْ يَـحْكُمْ ؛ فَهُوَ ظَاْلِـمٌ فَاْسِقٌ )) ، واتە : ئەوەی نكوڵی لەوە بكات كە خوای پەروەردگار دایبەزاندووە ، ئەوە كوفری كردووە ، و ئەوەش باوەڕی پێهەیە و دانی پێداناوە بەڵام حوكمی پێناكات ، ئەمەیان ستەمكار و تاوانبارە .

و خودی ( طَاْوُوس ) یش ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ سەباەت بە ئایەتەكە فەرموویەتی : (( لَيْسَ بِكُفْرٍ يَنْقُلُ عَنِ الْـمِلَّةِ )) ، واتە : كوفرێك نییە لە ئایین دەری بكات ـ واتە : كوفری گەورە نییە ـ .

و ( عَطَاْءِ بْنِ أَبِي رَبَّاْح ) یش ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ سەبارەت بە ئایەتەكە فەرموویەتی : (( كُفْرٌ دُوْنَ كُفْرٍ ، وَفِسْقٌ دُوْنَ فِسْقٍ ، وَظُلْمٌ دُوْنَ ظُلْمٍ )) [١] ، واتە : كوفری بچووك ، تاوان و ستەمە .

---

[١] ( الصحيحة ، للألباني : ٦ / ١١١ ـ ١١٣ ) .

[١] بۆ زانینی وردەكاری ئەم ڕیوایەتانە بڕوانە : ( الصحيحة : ٦ / ١١١ ـ ١١٤ ) .

**ڕوونکردنەوەی سێیەم کە پێویستە لێرەدا بزانرێت :** ئەوەیە کە پێشەوایان وەکو شوێنکەوتنێك بۆ هاوەڵان وشوێنکەوتوانیان تەفسیری ئایەتەکەیان کردووە ، لەوانەش :

( إِسْمَاعِيْل ) ـی کوڕی ( سَعْد ) دەگێڕێتەوە : (( پرسیارم کرد لە پێشەوا ( أَحْمَد ) کوڕی ( حَنْبَل ) سەبارەت بە ئایەتی : ﴿ وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ ﴾ [ المائدة : ٤٤ ] ، و وتم : ئەم کوفرە چییە لە ئایەتەکەدا ؟ فەرمووی : **کوفرێك خاوەنەکەی لە ئایینی ئیسلام ناباتە دەرەوە** )) [1] .

پێشەوا ( الْقُرْطُبِي ) ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ فەرموویەتی : (( وتەی خوای پەروەردگار : ﴿ وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ ﴾ [ المائدة : ٤٤ ] ، بەڵگە بە ڕووکەشی ئایەتەکە دەهێننەوە ئەوانەی کە بە تاوان تەکفیری موسوڵمان دەکەن ، کە ئەوانیش خەواریجەکانن ، و هیچ بەڵگەیەکی تێدا نییە بۆیان ، چونکە ئایەتەکان لەسەر جولەکەکان دەبەزیوون کە کەلام و قسەکانی خوا دەگۆڕن لە مەبەستی خۆیان ، هەروەکو لە فەرموودەکەدا هاتووە ، کە خۆیان بێباوەڕ و کافربوون ، بۆیە هاوبەشیانە لە حوکمدا ئەوەی هاوبەشیان بێت لە هۆکاری هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان .

و ڕوونکردنەوەی ئەمەش لەوەدایە : کە بێگومان ئەگەر موسوڵمان حوکمی خوای پەروەردگار بزانێت لە کێشەیەکدا ، پاشان حوکمی پێ ناکات ، جا ئەگەر لە نکوڵیەوە بێت ئەوە کافر دەبێت ، هیچ جیاوازیەك لەمەدا نییە ، و **ئەگەر لە نکوڵەوە نەبوو ئەوە تاوانبارە و تاوانێکی گەورەی ئەنجام داوە** ، چونکە ئەو باوەڕی بە بنەوای ئەو حوکمە هەیە ، و زانایە بەوەی کە پێویستە لەسەری جێبەجێی بکات ، کەچی سەرپێچی کردووە بە وازهێنانی لە کردەوە پێکردنی ، ... و هەر ئەمەشە بۆچوونی ئەهلی سوننە )) [1] .

و پێشەوا ( ابْنِ الْقَيِّم ) ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ فەرموویەتی : (( وتەی دروست ئەوەیە : کە حوکم کردن بە جگە لەوەی کە خوای پەروەردگار دایبەزاندووە هەردوو جۆرەکەی کوفر ـ بچووك و گەورە ـ دەگرێتەوە ، **ئەوەش بەپێی حاڵی حاکمەکەیە : ئەگەر** باوەڕی بە واجێتی حوکم بوو بەوەی کە خوای پەروەردگار دایەبزاندووە لەو ڕووداوە ، کەچی لێی لایداوە وەکو تاوانێك ، لەگەڵ دان نانی بەوەی کە شایستەی سزایە ، ئا ئەمەیان کوفری بچووکە . **بەڵام ئەگەر** باوەڕی وابوو کە ئەوە واجب نییە ، و ئەو سەرپشکە تێیدا ، لەگەڵ دڵنیابوونی لەوەی کە حوکمی خوایە ، ئا ئەمەیان کوفرە گەورەیە ، **و ئەگەر** نەیزانی و هەڵەی تێداکرد ، ئا ئەمەیەن هەڵەی کردووە ، و حوکمی هەڵەکارانی بۆ هەیە )) [1] .

---

[1] ( سؤالات ابن هانئ : ٢ / ١٩٢ ) .

[1] ( المفهم لما أشكل من تلخيص كتاب مسلم ، للقرطبي : ١٦/ ٣٦ ) .

[1] ( مدارج السالكين بين منازل إياك نعبد وإياك نستعين ، لابن القيم : ١/ ٣٤٥ـ٣٤٦ ) .

**چوارەم ڕوونكردنەوە كە پێویستە لێرەدا بزانرێت ئەوەیە كە :** بە ڕەها تەكفیركردنی هەموو ئەو كاربەدەستانەی كە حوكم بەوە ناكەن كە خوای پەروەردگار دابەزاندووە ـ بە بێ تەفصیل ـ ، و بەبەڵگە هێنانەوە بەم ئایەتە ، كار و كردەوە و پیشەی خەواریجە حەروریەكان و پاشكۆ و میراتگرەكانیانە ، ( أَبُو حَيَّانَ ) ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ فەرموویەتی : (( خەواریجەكان بەڵگەیان بەم ئایەتە هێناوەتەوە لەسەر ئەوەی كە هەر كەسێك سەرپێچی خوای پەروەردگاری بكات ئەوە كافرە ، و وتوویانە : هەر ئەم ئایەتە دەقە لەسەر كافرێتی هەموو ئەوانەی كە حوكم دەكەن بە جگە لەوەی كە خوای پەروەردگار دابەزاندووە )) [٤] .

و پێشەوا ( الْجَصَّاصِ ) یش ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ هەمان واتا دووبارە دەكاتەوە و دەڵێت : (( خەواریج ئەم ئایەتەی وا لێك داوەتەوە و كردوویانەتە بەڵگە لەسەر تەكفیركردنی ئەوەی وازیهێناوە لە حوكمكردن بەوەی كە خوای پەروەردگار دایبەزاندووە ئەگەر بەبێ نكولیكردنیشی بێت ، و ئەوانەشیان تەكفیركردووە كە بەتاوانی گەورە یان بچووك سەرپێچی خوای پەروەردگار بكات )) [٣] .

شێخی ( الأَلْبَانِي ) ـش ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ فەرموویەتی : بنەوای ئاشوب و فیتنەی تەكفیر لەم سەردەمە ـ بەڵكو سەردەمانێكی زۆرە ـ ئایەتێكە هەموو كاتێك باسی لێوە دەكەن ، كە ئەویش ئایەتی : ﴿ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللهُ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ ﴾ [ المائدة : ٤٤ ] ، كە بەبێ تێگەیشتنێكی قوڵ وەری دەگرن ، و دەیهێننەوە بە بی زانینێكی ورد ... و كۆمەڵەی تەكفیر و ئەوانەش كە لێیانەوە دروست بوون ، بەگشتی حوكمی پاشگەزبوونەوە دەدەن لەسەر كاربەدەستان ، بەڵكو ئەوانەش كە لە ژێر دەسەڵات و فەرمانی ئەواندا دەژین و كارمەندن ، ئەوەش بەپێی ئەو دید و بۆچوونە بەتاڵەی كە هەیانە ، ئەوەش لەبەر ئەوەی ئەوان تاوانیان كردووە و بەو كارەیان كافر بوون [١] .

---

[٤] ( البحر المحيط : ٣ / ٤٩٣ ) .

[٣] ( أحكام القرآن ، للجصاص ، تحقيق : قمحاوي : ٤ / ٩٤ ) .

[١] ( شريط ( ٦٧٠ ) ، بتاريخ : ( ٧ / ١١ / ١٩٩٩مـ ) ، و ( جريدة الشرق الأوسط : ٧ / ٩ / ٢٠٠١ مـ ) .

**پێنجەم ڕوونکردنەوە کە پێویستە لێرەدا بیزانین :** ئەوەیە کە زانایانی سەردەم ئەو بۆچوونەیان نییە بۆ تەفسیری ئایەتەکە کە خەواریجە کۆنەکان و شوێنکەوتوانیان دەیکەن .

شێخ ( الشَّنْقِيْطِي ) . رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى . فەرموویەتی : (( بێگومان زاراوە ( الْكُفْرَ وَالظُّلْمَ وَالْفِسْقَ ) ، هەریەکێك لەوانە گوزارشی لێکراوە لەشەرعدا بەگشتی ، بۆیە جاری وا هەیە مەبەست لێیان تاوانە ، و جاری واش هەیە مەبەست پێیان ئەو کوفرەیە کە ئەنجامدەرەکەی لە ئایین دەردەکات ، لەوانەش : ﴿ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ ﴾ ، ئەگەر وەکو بەرهەڵستی بێت بۆ پەیامبەران ، و پوچەڵکردنەوەی حوکمی خوا بێت ، ئەو کاتە هەر سێکەیان بە واتای ئەو کوفرە دێن کە خاوەنەکەیان لە ئایین دەکەنە دەرەوە . بەڵام : ﴿ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ ﴾ باوەڕی وا بێت کە حەرامێکی ئەنجام دابێت ، و خراپەیەکی ئەنجام داوە ، ئەو کاتە لە ئایین دەری ناکەنە دەرەوە ))[1] .

شێخ ( عَبْدِالْعَزِيْزِ بْنِ بَاْز ) . رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى . فەرموویەتی : (( ئەوانەی کە حوکم دەکەن بە جگە لەوەی کە خوای پەروەردگار دایبەزاندوە چەند بەشێکن ، و حوکمی جیاوازیشیان هەیە ئەوەش بەپێی بیروباوەڕ و کردەوەیان : جا ئەوانەی کە حوکم بە جگە لەوە دەکات کە خوای پەروەردگار دایبەزاندووە ، و وادەبینێت کە ئەوە لە شەعەکەی خوا باشترە ، ئەوە کافرە لەلای هەموو موسوڵمانان ، بەهەمان شێوە ئەوەش کە بە یاسا دەستکردەکان کار دەکات لە جیاتی شەرعەکەی خوا ، و وادەبینێت کە ئەو کارەی جائیزە ـ ئەگەرچی بڵێت : شەرعەکەی خوا باشترە ـ ئەمەش کافرە چونکە ئەوەی حەڵاڵ کردووە کە خوای پەورەردگار حەرامی کردووە .

ئەما ئەوەی کە حوکم بە جگە لەوە دەکات وەك شوێنکەوتنێك بۆ ئارەزووەکانی ، یان لەیەر بەرتیلێك ، یان لەبەر دژایەتیەك لە نێوان خۆی و کەسی حوکم لەسەر دراو ، یان لەبەر هۆکاری تر ، و دەشزانێت کە سەرپێچی خوای پەروەردگاری کردووە ، بەڵکو ئەوەی پێویستە لەسەری شەرعەکەی خوا بکات بە دادوەر ، ئا ئەمە لە خەڵکانی تاوانبار و خاوەن تاوانی گەورەن ، و کفر و ستەم و تاوانی بچوکی ئەنجام داوە ، هەروەکو ئەم مانایە لە ( ابْن عَبَّاْس ) . رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا . ، و ( طَاْوُس ) ، و کۆمەڵێك لە پێشینەوە دەیگێڕنەوە ، و زانراویشە لە لای زانایان ))[1] .

---

[1] أضواء البيان" (٢/ ١٠٤) .

[1] ( مجموع فتاوى ابن باز : ٤ / ٤١٦ ، حكم من يحكم بغير ما أنزل اللّه ) .

شێخ ( **الأَلْبَانِي** ) .رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى. فەرموویەتی : (( ئایا مەبەست لە کوفر چییە لە ئایەتەکە ؟ ئایا مەبەست پێی دەرچوونە لە ئایین ؟ یان جگە لەوەیە ؟ بۆیە دەڵێم : دەبێت وردەکاربین لە تێگەیشتنی ئایەتەکە ، چونکە لەوانەیە مەبەست پێی کوفری کرداری بێت ، و ئەوەش کە یارمەتیدەری ئەم تێگەیشتنە بێت ( حَبْرُ الْأُمَّةِ وَتُرْجُمَانُ الْقُرْآنِ عَبْدُاللَّهِ بْنُ عَبَّاس ) ـە .رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا . ، کە هەموو موسوڵمانان بە گشتی جگە لە کۆمەڵ و گروپە گومڕاکان یەك دەنگن لەسەر ئەوەی کە پێشەوایەکی ناوازەیە لە ڕاڤەی قورئاندا ، وەك ئەوەی بڵێیت گوێی لێبووە کە خەڵکانێك هەن بە شێوەیەکی ڕووکەشانە لە ئایەتەکە تێدەگەن بە بێ هیچ تەفصیلێك ، بۆیە فەرموویەتی : (( ئەو کوفرە نییە کە ئێوە بۆی دەچن ، و کوفرێکیش نییە خاوەنەکەی لە ئایین بکاتە دەروە ، بەڵکو کولری بچوکە )) ، لەوانەشە مەبەستی بەم وتەیە خەواریجەکانیش بێت ، کە لە پێشەوای موسوڵمانان ( عَلِي رضي الله عنه ) درشوون ، پاشان ئاکامەکەشی ئەوەبوو کە خوێنی موسولمانانیان رشت ، ئەوەیان پێکردن کە بە هاوەڵبڕیاردەرانیان نەدەکرد !! فەرمووی : بەو شێوە نییە کە گومانی دەکەن ، بەڵکو کوفری بچووکە )) [١] .

شێخ ( ابْنُ عُثَيْمِيْن ) ـیش .رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى. : هەمان تەفصیلی ئەو زانایانەی سەروە دەدات کە خرایەڕوو لە وتەکانیاندا [١] .

**بەمەش ئەوە ڕوون دەبێتەوە کە :** خەواریجە کۆنەکان و شوێنەکەوتووە تەکفیریەکانیان لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا (( نەك هەر تەنها پێچەوانەی پێشینە یەکەمینەکان بوونەتەوە ، بەڵکو پێچەوانەی شوێنکەوتوانیانیش ـ لە ڕاڤەوانان و شەرعزانان و فەرمودەناسانیش ـ بوونەتەوە ، کەواتە ئەوان پێچەوانەی کۆمەڵی ڕزگاربوو بوونەتەوە )) [٤] .

---

[١] ( التحذير من فتنة التكفير ، ص ٥٦ ) ، وينظر : ( الصحيحة : ٦ / ٤٥٧ ـ ٤٥٨ ، تحت حديث رقم : ٢٧٠٤ )

[١] بڕوانە : ( شريط : التحرير في مسألة التكفير ، بتاريخ : ٢٢/ ٤/ ١٤٢٠ ) .

[٤] ( دروس للشيخ الألباني : ٤٢ / ١٤، بترقيم الشاملة آليا ، حكم الحاكم بغير ما أنزل اللّه ) ، و ( تفريغات أشرطة العلامة محمد ناصر الدين الألباني : ٢٨ / ٣٨٧ ) .

**پاش زانینی ڕاڤە و تەفسیری ئایەتەکەی حوکم** ، پێویستە لێرەدا بنێشتە تاڵەی دەمی خەڵکانێکی تەکفیری و مۆدەکەی ئەم سەردەمە ڕوون بکەینەوە کە لە ڕاستیدا : وتەیەکی هەقە و بەکارهێنانی هەڵەی بۆ دەکرێت ، ئەویش ئەوەیە کە دەڵێن : [ **دەبێت کوفر بە تاغوت بکرێت** ] ، کە بەڵگە و بەهانەی سەر زاری هەموو زیادڕەیکارێکی تەکفیرییە !!

جا با بزانین واتای [ **کوفرکردن بە تاغوت** ] ئەوەیە کە هەموومان ـ بەنەزان و زاناوە ، بە گەنج و لاو و پیرەوە ، بە خوێندەواری شەرعی و نەخوێندەواریەوە !!! ـ بکەوینە تەکفیرکردنی کاربەدەستی موسوڵمانان ، یان لە شەریعەتدا واتایەکی تری هەیە ؟

**لە ڕوونکردنەوەی ئەم باسەدا دەوترێت :** نەخێر ، بەو شێوە نیە کە خەڵکانێکی کاڵفام و نەخوێندەوار بە شەریعەت لێیتێگەیشتوون ، بەشێوەی ـ شەلم کوێرم ناپاریزم ـ بەگەنج و لاو نەزانەوە کەوتونەتە تەکفیرکردنی گشتی بۆ کاربەدەستانی موسوڵمانان !!! ، بەڵکو ئەوەش بەکافریان نەزانێت بە کافر و عەمیل و .... هتد دەزانن !!

زۆربەشیان ـ واتە : ئەو کەنج و لاو و کاڵفامانە ـ بەداخەوە هەمان بەڵگەی خەواریج و بەهەمان شێوە هەڵە تێگەیشتنی ئەوان بەڵگە بە هەندێك ئایەت دەهێننەوە ، لەوانەش : ﴿ وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللهُ فَأُولَـٰئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ ﴾ [ المائدة : ٤٤ ] .

یان بەڵگە بە ئایەتی تر دەهێننەوە بۆ بۆچوونە هەڵە و لاڕێکەیان ، لەوانە : ﴿ فَمَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِنْ بِاللَّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَى لَا انْفِصَامَ لَهَا وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٥٦﴾ ﴾ [ البقرة : ٢٥٦ ] ، واتە : جا هەر کەس کوفر بەهەموو ئەوانە بکات کە جگە لەخوای پەروەردگار دەپەرەسترێن و باوەڕ بەخوا بهێنێت ، ئەوا بێگومان سەقامگیر و جێگیر و بەردەوام بووە لەسەر باشترین ڕێگە ، و لە ئاینیشدا دەستی گرتوە بە بەهێزترین هۆکار کە پچڕانی بۆ نیە . و خوای پەروەردگاریش بیسەری وتەی بەندەکانیەتی ، و زاناشە بە نیەت و کردارەکانیان ، و لەسەر ئەوەش پاداشتیان دەداتەوە .

ئەگەر وردبینەوە لە واتای ئایەتەکە دەبینین ، مەبەست پێی واتای شەیەتومانە ( لَا إِلَـٰهَ إِلَّا اللَّـهُ ) ، کە ماناکەی بریتیە لە : بەدڵ و دەروون باوەڕبوون و شایەتیدان بە زمان بەوەی کە هیچ پەرستراوێك نییە بەهەق شایستەی پەرستن بێت جگە لە ( اللَّـه ) نەبێت .

بە شێوەیەك برگەی ﴿ مَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ ﴾ لە ئایەتەکەدا بە واتای : [ لَا إِلَـٰهَ ] دێتەوە ، و برگەی ﴿ وَيُؤْمِنْ بِاللَّهِ ﴾ ساش بە واتای : [ إِلَّا اللَّـهُ ] دێتەوە . بەواتایەکی تر : دەبێت کەسی باوەڕدار هەموو جۆرە پەرستشەکان بە شایستە نەزانێت بۆ جگە لە خوای پەروەردگار ، و هەمووشی جێگیر

بکات و بیسەلمێنێت بۆ خوای پەروەردگار ، واتە : ﴿ مَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ ﴾ : باوەڕت وابێت کە کەس شایستەی پەرستشەکان نییە جگە لە ( اللَّـه ) نەبێت ـ بەپەرستنی بێت ، یان بەشوێنکەوتنی و بەگوێڕایەڵیکردنی ـ ، جا لە بیروباوەڕدا بێت یان لە گوفتار و کرداردا .

پێشەوا ( ابْنُ الْقَيِّم ) ـ رَحِمَهُاللَّهُتَعَالَى ـ لە پێناسەی ( الطَّاغُوت ) ـدا فەرموویەتی : (( مَا تَجَاوَزَ بِهِ الْعَبْدُ حَدَّهُ ، مِنْ مَعْبُودٍ ، أَوْ مَتْبُوعٍ ، أَوْ مُطَاعٍ )) [1] ، واتە : بریتیە لە تێپەڕاندنی سنور لە لایەن بەندەکانەوە بۆ پەرستراو یان شوێنکەوتراو ، یان گوێڕایەڵیکراوێك .

زاراوەی ( الطَّاغُوت ) : لە ( الطُّغْيَان ) ـەوە وەرگیراوە ، و ( الطُّغْيَان ) ـیش : سنور بەزاندن و تێپەڕاندنێتی ـ لە زمانەوانیدا بێت یان لە شەرعدا ـ ، لە زمانەوانیدا دەوترێت : ( طَغَى الْمَاءُ ) ، واتە : سنوری خۆی بەزاند و تێپەڕاند ، لە شەریعەتیشدا ( الطَّاغُوت ) : وتەیەکی گشتیی لە هەموو ئەوانەی دەگرێتەوە کە دەپەرسترێت جگە لە خوای پەروەردگار ، و خۆشیان ڕازین بەو زیادڕەوی لێکردن و سنور شکاندنەی کە بەرامبەریان دەکرێت . جا ئەگەر زیادڕەوی کرا لە مرۆڤێك ـ یان هاوشێوەکانی ـ ، زیاد لەسەر ئەو سنور و پلەیەی کە شەرع بۆی داناوە ـ لەپەرستندا بێت ، یان لەشوێنکەوتن و لەگوێڕایەڵیکردنیدا بێت ـ ، ئەوە پێدەوترێت ( الطاغوت ) ، بەڵام ئەگەر ڕازی نەبێت بەو کارە بەرامبەری بکرێت بەو ناوە ناوزەد ناوکرێت .

مانای : (( مَا تَجَاوَزَ بِهِ الْعَبْدُ )) ، واتە : بەندە ئەو سنورە بشکێنێت کە شەرع پێویستی کردووە لەسەری و بۆی دیاریکردووە ، و ڕێی نەداوە بە تێپەڕاندن و پێچەوانە بوونەوەی .

و مانای (( حَدَّهُ )) واتە : سنوری بەندایەتی و پەرستنی بۆ خوای پەروەردگار بە تاك و تەنهایی .

و کە فەرموویەتی : (( مِنْ مَعْبُودٍ )) مەبەست پێی ئەوەیە : ئەگەر شتێك بپەرستێ جگە لە خوای پەروەردگار بە هەر جۆرێك لە جۆرەکانی پەرستن .

و مەبەستی لە : (( أَوْ مَتْبُوعٍ )) ئەوەیە : کە شوێنی پەیامبەری خوا ﷺ بکەوێت لەوەی کە فەرمانی پێکردووە لە حەڵاڵکردن و حەرامکردندا ـ لە قورئاندا بێت یان لە سوننەتدا ـ ، نەك شوێنی کەسێکی تر بکەوێت ، چونکە شوێنکەوتنی بۆ جگە لەو لەحەڵکردن و حەرامکردندا بە پێچەوانەی شەریعەت ، ئەو کەسەی کردووە بە ( طَاغُوت ) ـی خۆی .

---

[1] ( إعلام الموقعين عن رب العالمين ، لابن القيم : ١ / ٤٠ ) .

و مەبەستیش لە :(( أَوْ مُطَاعٍ )) : ئەوەیە گوێڕایەڵی جگە لە خوای پەروەردگار و پەیامبەرەكەی ﷺ بكات لە تاوان بێت ، یان لە حەڵاڵ و حەرامكردندا ، چونكە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (( لَا طَاعَةَ لِـمَخْلُوقٍ فِي مَعْصِيَةِ الْـخَالِقِ )) ( الصحيحة ، برقم : ١٧٩ ) ، واتە : تاعەت و گوێڕایەڵی نییە بۆ هیچ دروستكراوێت لە سەرپێچی پەروەردگاردا .

واتە : ( الطَّاغُوت ) لە لایەكەوە : بە پێی ڕەچاوكردن و ڕوانینە بۆ ئەو كەسەی كە پەرستشەكە بۆ ( طَاغُوت ) ـەكە دەكات ، یان شوێنی دەكەوێت ، یان گوێڕایەڵی بۆ دەكات ، و سنوری خۆی دەشكێنێت و دەیبەزێنێت ، و دەیخاتە ئاستێكەوە لەسەروی ئاستی خۆیەوە كە شەرع بۆ دیاریكردووە ، كە دەبێت پەرستراوی ئەو تەنها ( اللَّـه ) بێت نەك جگە لەو ، و شوێكەوتن و گوێڕایەڵیەكەشی بۆ شەرعەكەی خوا بێت كە لە قورئان و سوننەتدا هاتووە ، نەك بۆ شتیتی تر .

لە لایەكی تریشەوە : دەڕوانرێتە خودی ( الطَّاغُوت ) ـەكە ڕەچاوی ڕازی بوونی دەكرێت لەوەی كە ئەو شتانە بەرامبەر بكرێن ـ لە پەرستن و شوێنكەوتن و گوێڕایەڵیكردندا ـ .

**لەلایەكی ترەوە** ـ كە ئەمەیان تێبینیەكی زۆر گرنگە ـ بڕگەی : ﴿ مَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ ﴾ لە زمانی عەرەبیدا جیاواز لەوەی كە سەرانی تەكفیر بەواتای : ( يُكَفِّرُونَ الطَّاغُوت ) بەكاری دەهێنین .

چونكە مانای ﴿ مَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ ﴾ بریتیە لە : خۆبەریكردن لە هەموو پەرستراوەكان جگە لە خوای پەروەردگار ، و دژایەتیكردن ، و ڕقلێبوونیان ، و بیروباوەڕبوونی ئەوەی كە عیبادەت و پەرستش بۆ جگە لە خوای پەروەردگار ناڕەوا و پوچەڵ و هاوەڵبڕیاردانە ، بۆیە دەبێت بە كردار ئەوە بسەلمێنرێت و لە پەرستنی هەموو پەرستراوێك جگە لە خوای پەروەردگار دووربكەوینەوە ، وەك هانابۆبردن و لێپاڕانەوەیان بۆ دوورخستنەوەی بەلاّ و موصیبەتەكان ، و بەدەستهێنان و جێبەجێكردنی پێویستیەكان ، و ... هتد لە جۆرەكانی عیبادەت و پەرستش .

پێشەوا ( ابْنُ كَثِيـر ) .رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى. فەرموویەتی : (( وَقَوْلُهُ : ﴿ فَمَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِنْ بِاللَّهِ ... ﴾ أَيْ : مَنْ خَلَعَ الْأَنْدَادَ وَالْأَوْثَانَ وَمَا يَدْعُو إِلَيْهِ الشَّيْطَانُ مِنْ عِبَادَةِ كُلِّ مَا يُعْبَدُ مِنْ دُونِ اللَّـهِ ، وَوَحَّدَ اللَّـهَ ، فَعَبَدَهُ وَحْدَهُ ، وَشَهِدَ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ )) [1] .

---

[1] ( تفسير ابن كثير / دار طيبة (١/ ٦٨٣) .

شێخ ( السَّعْدِي ) .رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى. فەرموویەتی : (( ﴿ فَمَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ ﴾ : فَيَتْرُكُ عِبَادَةَ مَا سِوَى اللَّهِ وَطَاعَةَ الشَّيْطَانِ ، ... )) [1] .

و شێخ ( ابْنُ بَاز ) ـیش .رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى. فەرموویەتی : (( قَالَ .جَلَّ وَعَلا. : ﴿ فَمَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ ﴾ يَعْنِي : يُنْكِرُ عِبَادَةَ غَيْرِ اللَّهِ ، وَيَتَبَرَّأَ مِنْهَا ، وَيَجْحَدَهَا ، وَيُبَيِّنُ أَنَّهَا بَاطِلَةٌ )) [1] .

و شێخ ( ابْنُ عُثَيْمِيْن ) ـیش .رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى. فەرموویەتی : (( وَالْكُفْرُ بِالطَّاغُوتِ مَعْنَاهُ : الْبَرَاءَةُ مِنَ الشِّرْكِ وَأَهْلِهِ ، وَإِنْكَارُ ذَلِكَ ، وَاعْتِقَادُ بُطْلَانِهِ )) [1] .

کەواتە واتای [ **کوفرکردن بە تاغوت** ] ئەوە نییە کە هەموومان ـ بەنەزان و زاناوە ، بە گەنج و لاو و پیرەوە ، بە خوێندەواری شەرعی و نەخوێندەواریەوە !!! ـ بکەوینە تەکفیرکردنی کاربەدەستی موسوڵمانان ـ بە بیانووی ئەوەی کە حوکم بە جگە لەوە دەکەن کە خوای پەروەردگار داییەزاندوە !!! ـ ، بەو شێوەیەی کە خەڵکانێکی کاڵفام و نەخوێندەوار بە شەریعەت لێیتێگەیشتوون ، و ( شەلم کوێرم ناپاریزم !!! ) کەوتونەتە تەکفیرکردنی گشتی کاربەدەستانی موسوڵمانان !!! ، بەڵکو کار گەشتوەتە ئەوەی کە : ئەوەش بەکافریان نەزانێت بە کافر و عەمیل و .... هتد دەزانن !!!

**لەلایەکی ترەوە :** ئەگەر برگەی : ﴿ مَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ ﴾ لە زمانی عەرەبیدا کوت و مت بە واتای تەکفیر کردنی سەرکردەکان بهاتابە ـ واتە : ( يُكَفِّرُونَ الطَّاغُوت ) ـ ، ئەوا ئەو هاوەڵ و شوێنکەوتوانەیان و راڤەوانانی تەفسیر ـ لە کۆن و تازەدا ـ ، و پێشەوایان و زانایان ئەوەیان نەدەووت کە لە پێشتر خرایە ڕوو ... خوای پەروەردگاریش زاناتر و خەبیرە بە ڕاستیەکان .

[1] ( تفسير السعدي (ص: ١١٠) .

[1] ( مجموع فتاوى ابن باز(٣٠)جزءا (٤/ ٩) ، وينظر : مجموع فتاوى ابن باز(٣٠)جزءا (٤/ ٨)

[1] شرح الأصول الثلاثة بن باز (ص: ٢٧) الحاشية . وينظر : تفسير العثيمين: الفاتحة والبقرة (٣/ ٢٦٦).

## حوكمی گاڵتەكردن و سوكایەتی بە خوای پەروەردگار و پەیامبەر ﷺ و ئایینەكەی و جنێودان پێیان :

بێگومان گاڵتەكردن و سوكایتی بە خوای پەروەردگار و پەیامبەر ﷺ و ئایینەكەی و جنێو پێدانیان كوفر و بێباوەڕی گەورەیە و خاوەنەكەی لە ئایین دەچێتەدەر ئەگەر بە گاڵتەوە بێت ، یان بەیاریكردنیشەوە بێت ، بەڵگەش وتەی خوای پەروەردگارە كە فەرموویەتی : ﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ قُلْ أَبِاللهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنْتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ ﴿٦٥﴾ لَا تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُمْ بَعْدَ إِيمَانِكُمْ ... ﴿٦٦﴾ ﴾ [ التوبة : ٦٥ ـ ٦٦] ، واتە : ئەگە لێیان بپرسی سەبارەت بەو قسانەی كە تانەی پێدەدەن لە تۆ و هاوەڵانت ؟ ئەوان لە وەڵامدا دەڵێن : لە ڕاستیدا ئێمە تەنها قسە و باسمان دەكرد و هیچ مەبەستێكمان نەبوو ، تۆش پێیان بڵێ : ئایا گاڵتە بە خوای پەروەردگار و ئایەتەكانی و پەیامبەرەكەی ﷺ دەكەن ؟

دەسا بڕوبیانوو مەهێننەوە ، چونكە بێ نرخە و وەرناگیرێت ، و بەدڵنیایەوە كافر و بێباوەڕبوون بەو قسەیەی كە گاڵتەتان پێكرد و وتتان .

پێشەوا ( ابْنُ تَيْمِيَّة ) . رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى . فەرموویەتی : (( بێگومان ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە هەموو ئەو كەسانەی كە كەم و كوڕی ـ بەڕاستەوە یان بە گاڵتەوە ـ دەدەنە پاڵ پەیامبەری خوا ﷺ ئەوە كوفر و بێباوەڕیان كردووە ))[١] .

و هەر ئەم پێشەوایە . رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى . فەرموویەتی : بێگومان جنێودان بە خوای پەروەردگار و پەیامبەرەكەی ﷺ كوفرە لە ڕووكەش و لە ناخدا ، بەبێ جیاوازی لە نێوان ئەوەی كە جنێودەر بیروباوەڕی وا بێت كە ئەو كارە حەرامە ، یان ئەو كارەی حەڵاڵ كردبێت ، پاشان ئەمەشی داوەتە پاڵ شەرعزانان و هەموو ئەهلی سوننە . و دواتریش ئەم بۆچوونە دەداتە پاڵ پێشەوایان ( أَحْمَد ) . رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى . لە ڕوایەتی ( عَبْداللَّه وَأَبو طَالِب ) لێیەوە ، هەروەها لە پێشەوا ( الشَّافِعِي ) ـەوە . رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى . دەگێڕێتەوە كە پرسیاری لێكراوە سەبارەت بە هەسێك كە گاڵتە بە هەندێك لە ئایەتەكانی خوا بكات !! فەرموویەتی : كافر و بێباوەڕە ، و بەڵگەشی بە ئایەتەكەی سەرەوە هێناوەتەوە ...[٢] .

و پرسیاریش كرا لە شێخ ( الْأَلْبَانِي ) . رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى . بەم شێوەیەی : (( گاڵتەكردن بائایین ئەوەی كە لە وتەی خوای پەروەردگاردا هاتووە : ﴿ قُلْ أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ لا

---

[١] ( الصارم المسلول على شاتم الرسول ، لابن تيمية ، ص ٣١ ) .

[٢] ينظر : ( الصارم المسلول على شاتم الرسول ، لابن تيمية ، ص ٥١٢ ـ ٥١٣ ) .

تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُمْ بَعْدَ إِيمَانِكُمْ ﴾ [ التوبة : ٦٦ ] ، **پرسیار : ئایا كوفر لێرەدا كوفرێكی بیروباوەڕیە یان كرداریە ؟ )) .**

**شێخیش** ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ **فەرمووی : (( گومان لەودا نییە كە ئەم كوفرە كوفرێكی بیروباوەڕیە ، بەڵكو كۆفرێكە دوو شاخێشی هەیە ، چونكە گاڵتەكردن بە ئایەتەكانی خوای پەروەردگار هەرگیز ناكرێت لە باوەڕدارێكەوە بكەوێتەوە چەنێك باوەڕەكەی لاواز بێت ، ئەم جۆرەی كوفر لەو جۆرە كوفرانەیە كە وتەی پێشومان دەیگرێتەوە كە دەمانوت : ( نابێت موسوڵمان تەكفیر بكرێت ئیللا ئەگەر لە زمانیەوە شتێك دەرببڕێت بۆمان بەڵگە بێت لەسەر ئەوەی كە لە دڵیدایە ) ، بۆیە گاڵتەكردنی بەئایەتەكانی خوای پەروەردگار گەورەترین دانپیانانە لێیەوە لەسەر ئەوەی كە ئەو باوەڕی نییە بەوەی كە گاڵتەی پێدەكات ، بۆیە كافرە و كوفرەكەشی كوفرێكی بیروباوەڕیە ))** [٣] .

**و لە فەتوای ( اللَّجْنَةِ الدَّائِمَةِ لِلْبُحُوثِ الْعِلْمِيَّةِ وَالْإِفْتَاْء ) ـدا هاتووە كە : (( جنێودان بە خوای پەروەردگار كوفرێكی گەورەیە و پاشگەزبوونەوەیە لە ئیسلام ، ئەگەر ئەنجامدەرەكەی نیسبەتی بۆ ئیسلام هەبێت ـ واتە : موسوڵمان بێت ـ ، بەهەمان شێوە جنێودان بە پەیامبەری خوا ﷺ بە كۆڕای ئەهلی عیلم ))** [٢] .

**بیرخستنەوەیەكی گرنگ : دەبێت ئەوە بزانرێت كە جێبەجێكردنی سنورە شەرعیەكان و حوكمی كەسانی هەڵگەڕاوە لە ئایین بۆ كاربەدەستانی وڵات و نوێنەرانیەتی و تەنها ئەوان پێی هەڵدەستن ، ئەوەش لە دادگا شەرعیەكانەوە دەكرێت ، و كاری تایبەتی خەڵك نییە ، چ جای كەسانێك پێی هەستن كە نە مەرج نەش ڕێگرەكانی تەكفیر دەزانن ، پێشەوا ئەحمەد** ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ **فەرموویەتی : (( جێبەجێكردنی سنورە شەرعیەكان كاری پێشەوای موسوڵمانانە ، و هەر بەو شێوەیەش دەبێت ، و بۆ كەس نییە تانەیان لێبدات ، و كێبڕكێیان لەسەر بكات ، و هەوڵی ئەوە بدات ئەو مافەیان لێوەرگرێتەوە ))** [١] .

**و پێشەوا ( النَّوَوِي )** ـ رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى ـ **فەرموویەتی : ئەوەی كە هەڵدەستی بە جێبەجێكرد و پیادەكردنی سنورە شەرعیەكان تەنها پێشەوای موسوڵمانانە ، ئان ئەوەی كە ئیمان ئەو ئەركەی**

---

[٣] ( موسوعة الألباني في العقيدة (٥/ ٥٢٢) ، ( الهدى والنور : ٦٧٢ / ٤٤: ١٠: ٠٠ ) .

[٢] ( فتاوى اللجنة الدائمة للبحوث العلمية والإفتاء : ٢٧/ ٤٠٤) .

[١] ( أصول السنة ، لأحمد بن حنبل رواية عبدوس بن مالك العطار : ٣٠ ) .

پێدەسپێرێت ، چونکە جێبەجێکردنی سنورەکان لە سەردەمی پەیامبەری خوادا ﷺ بە ڕێپێدانی ئەو بووە ﷺ ، هەروەك لە سەردەمی جێنشینەکانیشیدا بە ڕێپێدانی ئەوان بووە [١] .

و شێخ ( ابْنُ عُثَيْمِيْـن ) . رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى . فەروویەتی : جێبەجێکردنی سنورە شەرعیەکان ئیشی پێشەوایانە ، سزادانیش بەهەمان شێوە ، بۆ کەس نییە دەستوەرداتە کاروباریانەوە ، و کە دەڵێم : پێشەوا ، سەرکردەی باڵای وڵاتە ، جا ناوی پاشابە ، سەرکردەیە ، یان پێشەوایە ، یان میر ، و شێخیش ، یان بۆ ئەوانەیە کە جێگری پێشەوایانن ، وەکو میری ناوچەکان و ... هتد [١] .

**باشە ئەگەر مەحاکمی شەرعی نەبوو ؟** ، شێخ ( ابْنُ بَاْز ) . رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى . لە وڵامی ئەوەدا فەرموویەتی : ئەگەر مەحاکمی شەرعی نەبوو ، ئەوا موسوڵمان تەنها ئامۆژگاری بۆ هەیە ، ئامۆژگاری کاربەدەستی موسوڵمانان دەکات ، و ڕێنیشاندەریان دەبێت بۆ خێر و چاکە ، و هاریکاری کردن لە گەڵیاندا ، تاکو شەریعەت جیبەجێدەکەن ، ئەما فرمان کار بەچاکە و قەدەغەکاری خراپە خۆی دەست بخاتە کارەکەوە ، یان بکوژێت و لە خەڵك بدات ، نەخێر ، چونکە نکوڵێکردن بە دەست ، بە کوشتن و لێدان خراپەیەکی زۆر و ئاشوبێ گەورەی لێدەکەوێتەوە بەبێ گومان [٣] .

---

[١] ( المجموع شرح المهذب ، للنووي : ٢٠ / ٣٤ ) .

[١] ( لقاء الباب المفتوح : ٧٥ / ١٨ ، بترقيم الشاملة آليا ، حكم إقامة العالم للحدود دون إذن الإمام ) .

[٣] نقلًا عن ( فتاوى الأئمة في النوازل المدلهمة ، لمحمد بن حسين بن سعيد ، ص٦٧ ـ ٦٨ ) .

## ئاكامە خراپ و ترسناكەكانی پەلەكردن
## و زیادڕەویكردن لە تەكفیر لەسەر تاك و كۆمەڵگای موسوڵمانان :

لە كۆتاییدا دەمانەوێت ئاماژە بە ئاكامە خراپ و ترسناكەكانی پەلەكردن و زیادڕەوی كردن لە تەكفیر لەسەر تاك و كۆمەڵگای موسوڵمانان بكەین ، ئەوەش بە خستنەڕووی لە چەنەند خاڵێكی پوختكراودا ، و بەم شێوەیەی خوارەوە .

١ - زیادڕەویكردن لە تەكفیر بەهانەیەكی نابەجێیە بۆ حەڵاڵكردنی خوێنی كەسانێكی موسوڵمانی شایستە نەبوو بە تەكفیر ، چونكە ئەو كارە حوكمدانە بەوەی كە كەسی دیاری كراو شایستەی كوشتنە و خوێنی حەڵاڵە ، لە كاتێكدا كە تاوانی كوشتنی موسوڵمانێك لە لای خوای پەروەردگار گەورەترە لە تاوانی ڕوخان و لەناوبردنی هەموو دونیا ـ كەعبەی پیرۆزیشی تێدا بێت ـ ، پەیامبەری خوا فەرموویەتی ﷺ : (( لَزَوَالُ الدُّنْيَا أَهْوَنُ عَلَى اللَّهِ مِنْ قَتْلِ رَجُلٍ مُسْلِمٍ )) [١] .

٢ - زیادڕەویكردن لە تەكفیر ڕێگەیەكە بۆ حەڵاڵكردن و تاڵانكردنی ماڵ و سامانی موسوڵمانان ـ جا تایبەت بێت یان دامەزراوە گشتیەكان ـ ئەگەرچی ئەو ماڵ و سامانە لە شەرعدا هەمووی پارێزراوە و دەستدرێژی كردنە سەریان حەرم و قەدەغەیە ، هەروەكو پەیامبەری خوا ﷺ لە حەجی ماڵئاواییدا فەرموویی : (( إِنَّ دِمَاءَكُمْ وَأَمْوَالَكُمْ وَأَعْرَاضَكُمْ عَلَيْكُمْ حَرَامٌ ، كَحُرْمَةِ يَوْمِكُمْ هَذَا ، فِي شَهْرِكُمْ هَذَا ، فِي بَلَدِكُمْ هَذَا ، فَلْيُبَلِّغِ الشَّاهِدُ الْغَائِبَ )) [١] ، واتە : هەموو ئەوانەتان لەسەر یەكتر حەرامە ... دەسا ئامادەبووان ئەوانە ئاگادار بكەنەوە كە لێرەنین .

٣ - ئەم كارە نابەجێیە میراتگرێتی لە نێوان موسوڵمان ناهێڵێتەوە ، چونكە تەكفیركردن حوكمدانە بەوەی كە ماڵ و سامانی ئەو كەسەی كە تەكفیركراوە نابێت بە میرات و دەبێت بخرێتە بەیتولمالی موسوڵمانانەوە ، بەشێوەیەك كەسی تەكفیركراو نابێت میرات لە میراتگرەكانیەوە وەربگرێت و بە پێچەوانەشەوە هەر نابێت میراتگری بن ، چونكە جیاوازی ئایین لە نێ،انیان دروست دەبێت .

٤ - تەكفیركردن ئەوە دەگەیەنێت كە دروست نییە كەسی تەكفیر كراو ژنی پێبدرێت ، یان ئەگەر ئافرەت بوو خوازبێنی بكرێت ، خۆ ئەگەر هاوسەرگیریشیان كردبێت دەبێت لێك جیابكرێنەوە ، چونكە گرێبەندی هاوسەرگیریان هەڵدەوەشێتەوە ، و بەوەش شیرازە و پەیوەندی خێزانی تێك دەچێت .

٥ - كەسی تەكفیركراو بەناهەق سەربڕاوی ناخورێت و حەرام دەبێت .

---

[١] صحيح الجامع ، برقم : ٥٠٧٧ .

[١] رواه البخاري ومسلم .

٦ - کەسی زیادڕەویکراو لە تەکفیرکردنی پاش مردنی نوێژکردنی لەسەر حەرام دەبێت ، و نابێت لە قەبرستانی موسوڵماناندا بنێژرێت .

٧ - و یەکێکی تر لەشوێنەوارە خراپەکانی زیادڕەویکردن لە تەکفیرکردن ـ ئەگەر تەکفیرکردنەکە بەرامبەر بە کاربەست و سەرکردەی موسوڵمانان بێت ـ ، ئەوا دەرچوون و یاخیبوون و دەستدانە چەك دژیان دروست دەکات ، چونکە بە گومانی زیادڕەویکاران کابەدەستانیان بێباوەڕ و کافرن ، و دەبێت لەناوببرێن و بگۆڕدرێن ، لە کاتێکدا کە پەیامبەری خوا ﷺ یاسا و بنەوایەکی تۆگمەی داناوە بۆ ئەو کارە ئەویش : (( أَنْ بَاْيَعَنَاْ عَلَى السَّمْعِ وَالطَّاْعَةِ فِي مَنْشَطِنَاْ وَمَكْرَهِنَاْ ، وَعُسْرِنَاْ وَيُسْرِنَاْ ، وَأَثْرَةٍ عَلَيْنَاْ ، وَأَنْ لَا نُنَاْزِعَ الْأَمْرَ أَهْلَهُ [ وَفِي رِوَاْيَةٍ : وَإِنْ أَكَلُوا مَاْلَكَ ، وَضَرَبُوا ظَهْرَكَ ] ، إِلاَّ أَنْ تَرَوْا كُفْراً بَوَاْحاً عِنْدَكُمْ مِنَ اللَّهِ فِيهِ بُرْهَاْنٌ )) [1] ، واتە : بەیعەتمان پێدا لەسەر گوێبیستبوون و گوێڕایەڵیکردنی کاربەدەستان لەوەی کە پێمان خۆشە و لەوەش کە پێمان ناخۆشە ، لە کاتی دژواری و ناڕەحەتی ، و خۆشگوزەرانی و ئاسانکاریدا ، و لەو کاتەش کە خەڵکانی تر پێشدەخرێن لەسەرمان ، و لەسەر ئەوەش کە هەوڵمان ئەوە نەبێت کە ئەمارەت و دەسەڵاتیان لێبسێنینەوە ، ئەگەرچی ماڵ و سامانمان بخوات و لەپشتیشمان بدات ، ئیللا لەو بار و حاڵەدا نەبێت کە کوفرێکی یەکلای گەورەی بەئاشکرای لێببینرێت ، و بەڵگەیەکی حاشا هەڵنەگرتتان لەسەری هەبێت لە خوای پەروەردگارەوە ـ کە ئەویش : دەقی ئایەتێکی قورئان بێت ، یان فەرموودەیەکی صەحیح ـ .

٨ - زیادڕەویکردن لە تەکفیر ناجێگیری و ئاشوب و فیتنە و خوێنڕشتنی ناوەتەوە ، لە نێو بەندەکان و لە وڵاتدا ، و هۆکاری گەورە بووە بۆ پارچە پارچەکردن و پەرتەوازەیی کۆمەڵگا ، و چاندنی تۆی ڕقەبەرێتی و دووبەرەکانی لە نێوان موسوڵماناندا هەر لە سەرەتای سەرهەڵدانیە لەلایەن خەواریجە حەروریەکانەوە بەدرێژایی چواردەسەدە .

٩ - زیادڕەویکردن لەتەکفیرکردن هۆکاری تاوانباربوون ئەنجامدەرەکەیەتی ـ ئەگە نەڵێین : خۆکافرکردنی خودی تەکفیرکارەکەیە ـ ، چونکە پەیامبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (( أَيُّمَا امْرِئٍ قَالَ لِأَخِيهِ يَا كَافِرُ فَقَدْ بَاءَ بِهَا أَحَدُهُمَا إِنْ كَانَ كَمَا قَالَ وَإِلَّا رَجَعَتْ عَلَيْهِ )) [1] .

---

[1] رواه البخاري ومسلم ، والزيادة في الصحيحة ، برقم : ٣٤١٨ .

[1] رواه البخاري ومسلم .

١٠ - زیادڕەویکردن لە تەکفیر هۆکاری ناشرین کردنی پاکێتی ئایینی ئیسلامە ، و کاریگەری نەرێنی لەسەر وێنەی ڕاستەقینەی جوانەکەی ئایین دەبێت ، کە لە ڕاستیدا ئایینی ئیسلام هیچ باوەڕی بەو زیادڕەویە نییە لە تەکفیرکردندا ، بەڵکو ئەو کارە بیروباوەڕی پیشەی خەواریجەکان بووە .

١١- زیادڕەویکردن لە تەکفیرکردنی موسوڵمانی ئەهلی قیبلە لادانە لە ڕێچکە و ڕێبازی هاوەڵە بەڕێزەکانی پەیامبەری خوا ﷺ کە ترسناکی ئەم کارەیان زانیوە بۆیە لێی دوور کەوتوونەتەوە ، ئەوەتا ( أَبو سُفْيَان ) دەفەرموێت : بە ( جَابِر ) ـی کوڕی ( عَبْداللَّـهِ ) ـم رضي الله عنه وت : (( هَلْ كُنْتُمْ تَقُولُونَ لِأَحَدٍ مِنْ أَهْلِ الْقِبْلَةِ - أَيْ : مِنَ الْـمُسْلِمِينَ - : كَافِرٌ ؟ قَالَ : لَا . قُلْتُ : فَكُنْتُمْ تَقُولُونَ : مُشْرِكٌ ؟ قَالَ : مَعَاذَ اللَّـهِ )) [1] ، واتە : ئایا ئێوە بە هیچ یەکێك لە ئەهلی قیبلەتان دەووت : کافر ؟ فەرمووی نەخێر ، وتم : ئەی دەتانووت : هاوەڵبڕیاردەر ؟ فەرمووی : پەنا بە خوای پەروەردگار لەو کارە .

١٢ - یەکێکی تر لە شوێنەوارە خراپەکانی زیادڕەوێکردن لە تەکفیرکردن بریتیە لە بڵاوکردنەوەی ڕق و کینە دووبەرەکی لە نێوان تاکەکانی کۆمەڵگا بەگشتی ـ تەنانەت لە نێو تاکەکانی خێزانێك چونکە کەسی زیادڕەویکار لە تەکفیر باوك و دایك و براکانی بەکافر دەزانێت !!! ـ .

١٣ - یەکێکی تر لە ئاکامە خراپ و ترسناکەکانی زیادڕەوی کردن لە تەکفیر لەسەر تاك و کۆمەڵگای موسوڵمانان کاری خۆتەقاندنەوە و تەقاندنەوەی خانووبەرە و ئۆتۆمۆبێل ، و تێکدانی دامەزراوە حکومی و کۆمەڵایەتیەکانی وڵاتی موسوڵمانانی لێدەکەوێتەوە ، کە هۆکاری تۆقاندن و ترساندنی کەسانی بەئارام ژیاوە لە زێد و حاڵی خۆیان ، بەڵکو هۆکاری ڕشتنی خوێنی کەسانی بێ تاوان ، و بەهەدەردانی موڵك و سامانیانە ، لە کاتێکدا خوای پەروەردگار هەموو ئەو کارانەی قەدەغەکردووە کە فەرموویەتی : ﴿ وَلَا تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ بَعْدَ إِصْلَاحِهَا ﴾ [ الأعراف : ٥٦ ] .

و پەیامبەری خواش ﷺ فەرموویەتی : (( لَا يَـحِلُّ لِـمُسْلِمٍ أَنْ يُرَوِّعَ مُسْلِماً )) [1] ، واتە : حەڵاڵ نییە بۆ هیییچ موسوڵمانێك موسوڵمانێك بتۆقێنێت .

١٤ - ئاکامێکی تر لە ئاکامە خراپەکانی زیادڕەویکردن لە تەکفیرکردن پێچەوانەبوونەوەیە لەگەڵ مامەڵە داناییەکانی پەیامبەری خوایە ﷺ لەگەڵ ئەوانەی کە ڕووکەشیان موسوڵمانێتی بووە ، ئەوەتا پەیامبەری خوا ﷺ کەسە دوو ڕووەکانی ناو کۆمەڵگاکەی کە بە وەحی پێی ناسێنراون و شەخص و ناوەکانیشیان دەزانێت ـ سەرباری ئەو هەموو دژایەتیەشیان بۆ پەیامبەر ﷺ و ئایینەکەی و هاوەڵانی ـ

---

[1] رواه الطبراني في المعجم الأوسط ، برقم : ٧٣٥٤ .

[1] صحيح الـجامع ، برقم : ٧٦٥٨ .

لەگەڵ ئەوەشدا نەیدەکوشتن ، بۆ ؟ بۆ ئەوەی خەڵك نەڵێت موحەممەد ﷺ هاوەڵانی خۆی دەکوژێت ، و لێی نەصڵێنەوە و لێی دوور نەکەونەوە ، هەروەك بە عومەری فەرموو کە پرسی پێکرد لە کوشتنی سەرێك لە سەرانی دووڕوان : (( دَعْهُ لَا يَتَحَدَّثُ النَّاسُ أَنَّ مُحَمَّدًا يَقْتُلُ أَصْحَابَهُ )) [1] .

کەچی کاکی زیادڕەویکار لە تەکفیرکردندا تەنانەت گوێی لەوەش نیە کە پێی بووترێت : باوك و براکەی خۆشیان تەکفیر دەکەن ، و بێگوێن لەوەی کە بەوکارەیان خەڵکی لە ئایین بڕەوێننەوە ، و دوریان بخەنەوە لە خواپەرستی یان نە !!!

**١٥** - کاریگەری نەرێنی دەبێت لە پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان ، چونکە پەیوەندی خزمایەتی و پەیوەندی خێزانی دەپچڕێنێت ، بەهۆی تەکفیرکردنی زیادڕەویکاران بۆ خزم و خێشیان و تەنانەت دایك و باوك و ئەندامەکانی خێزانەکەیان .

**١٦** - زیادڕەویکردن لە تەکفیر هاندەری توندڕەوێتییە - بەڵکو هەوێنی توندڕەوێتیە - ، و دەکرێتە بەهانە بۆ توند و تیژی و توندڕەوێتی دژ بە ئەو کەسە موسوڵمانەی کە بەگومانی - زیادڕەویکاران - کافر و بێباوەڕن ، و بەمەش توندوتیژی بڵاو دەبێتەوە ، و ئەمن و ئاسایشی تاکی موسوڵمان بەگشتی دەکەوێتە مەترسیەوە .

**١٧** - زیادڕەویکردن لە تەکفیر سەردەکێشێت بۆ شکاندنی شکۆی مرۆڤ و دەستدرێژی کردنە سەر مافەکانی بەگشتی .

**١٨** - زیادڕەویکردن لە تەکفیر هۆکاری دابڕکردنی گەنجانی موسوڵمانە لە مزگەوت و نوێژگەکان ، هەروەکو لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا بەرچاو دەکەوێت ، چونکە زیادڕەویکاران تەنانەت پێشنوێژ و وتارخوێنانی موسوڵمانانیش بە کافر و بێباوەڕ دەزانن ، و نوێژکردن لە پاشەوەیان بە دروست نازانن .

**و چەندەها ئاکامی تری خراپ و ترسناك لەسەر تاك و کۆمەڵگای موسوڵمانان ، بەمەش دەردەکەوێت کە : زیادڕەویکردن لە تەکفیر لەگەڵ مەبەستەکانی شەریعەتدا نایەتوە ، کە بریتین لە : [١] پاراستنی ئایین [٢] و نەفس [٣] و عەقڵ [٤] و وەچە [٥] و موڵك و سامان .**

---

[1] رواه البخاري ومسلم .

## [ پێرستی ناونیشان و سەربابەتەکان ] :

**ناونیشان و سەربابەتەکان** | **لاپەڕە**

چوارەم : دەبێت تاكە لەوانە بێت كە تەكلیفی شەرعیان لەسەرە ..................
پێنجەم : بوونی مەبەست ـ واتە : مەبەستی وتە یان كردەوە كوفریەكە ـ ....
شەشەم : كردنی ئیقامە حوججە لەسەر تاكی دیاریكراو ............................
ڕێگر و بەربەستەكانی پێش تەكفیركردنی تاكی تایبەت ...........................
یەكەم : ڕێگر و بەربەستی جەهل و نەزانین ( الْجَهْلُ ) ..............................
كێ ئەهلییەت و هەقی ئیقامەی حوججە هەیە ؟ .......................................
دووەم : ڕێگر و بەربەستی هەڵەكردن ..................................................
سێیەم : ڕێگر و بەربەستی لەبیرچوونەوە .................................................
چوارەم : ڕێگر و بەربەستی بە زۆرەملێ پێكردن ..........................................
پێنجەم : ڕێگر و بەربەستی هەڵەتێگەیشتن لە دەقەكان .........................
شەشەم : ڕێگر و بەربەستی بێتوانایی .................................................
حەوتەم : ڕێگر و بەربەستی نەبوونی تەكلیف و ئەهلیەت ..........................
تەفسیری ئایەتی : ﴿ وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ ﴾ .........
ڕوونكردنەوەی یەكەم : ئایەتەكە لەسەر جولەكە هاتووەتە خوارەوە .........
ڕوونكردنەوەی دووەم : پێشین تەفسیر ئایەتەیان بە كوفری بچووك كردووە ...
ڕوونكردنەوەی سێیەم : پێشەوایان هەمان تەفسیریان بۆ ئایەتەكە كردووە ...
چوارەم ڕوونكردنەوە : بە ڕەها تەكفیركردن پیشەی خەواریجە ..................
پێنجەم ڕوونكردنەوە : زانایانی سەردەم هەمان بۆچوونی پێشینیان هەیە .....
ڕوونكردنەوەی مانای : كوفر كردن بە تاغوت ..........................................
حوكمی سوكایەتی بە خوای پەروەردگار و پەیامبەر ﷺ و ئایینەكەی .........
جێبەجێكردنی سنورە شەرعیەكان بۆ كاربەدەستانی وڵات و نوێنەرانیەتی .....
ئەگەر مەحاكمی شەرعی نەبوو ، چی بكەین ؟ ..........................................
ئاكامە خراپ و ترسناكەكانی پەلەكردن و زیادڕەویكردن لە تەكفیر .........
پێڕستی ناونیشان و سەربابەتەكان ........................................................